# هۆکارەکانی

## سەرهەڵدان و ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان لەسەردەمی عەباسیدا

### لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری مێژوویییە

کامەران عەزیز عەبدوڵڵا

منتدى اقرأ الثقافي

هەولێر-٢٠١٢

# هۆکارەکانی

## سەرهەڵدان و ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان لە سەردەمی عەبباسیدا

**لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری مێژووییە**

**کامەران عەزیز عەبدوڵڵا**

**هەولێر-٢٠١٢**

* ناوی کتێب: هۆکارەکانی سەرهەڵدان و ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان لە سەردەمی عەبباسیدا.

* نووسەر: کامەران عەزیز عەبدوڵلا.

* بەرگ و سەرپەرشتیاری هونەری: عوسمان پیرداود .

* نەخشەسازی: عیسام موحسن.

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(١٦٢).

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٤٣٣ )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

# لیستی هێما کورت کراوەکان

س.پ : سەرچاوەی پێشوو

هـ.س : هەمان سەرچاوە

ب.س : بێ ساڵی چاپ

ب : بەرگ

ك : كۆچی

ز : زاینی

ل : لاپەرە

ت : توفي

هـ : الهجري

م : الميلادي

ج : الجزء

مج : المجلد

ق : القسم

(د.ت) : بدون تاريخ النشر

ص : صفحة

ص ص : صفحات

ش : الشمسي ( تایبەتە بە سەرچاوە فارسیەکان)

P: Page

PP: Pages

Vol: Volume

Ency: Encyclopedia

# پێشەکی وچوارچێوەی توێژینەوەکە

توێژینـەوە لـە سـەرهەڵدان و ڕووخـانی میرنـشینە کوردییـەکان لـە سەردەمی عەبباسیدا سوودێکی زۆری بۆ مێـژووی کـورد هەیـە، بـە تایبـەتی گرنگیدان بەو بنەما سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریانەی کە ڕۆڵیـان هـەبووە لە بنیاتنان و نەشونماکردنی دەسەڵاتی کوردی لەو سەردەمەدا، هەروەها ئەو فاکتەرە کارایانەی کە بەرەو ئاراستەی هەرەسهێنان و پووکانەوەیانی بردن.

وێڕای ئەوەی لێکۆڵینەوەی زانکۆیی سـەبارەت بـە مێـژووی میرنـشینە کوردەکـانی سـەردەمی عەبباسـی کـراوە، بـەڵام تـا ئێـستا توێژینەوەیـەکی ئەکادیمی تایبـەت بـە هۆکارەکـانی سـەرهەڵدان و ڕووخـانی ئـەو میرنـشینانە ئەنجام نەدراوە، لە بـواری هەڵـسەنگاندنی بـارودۆخی کۆمـەڵگای کـوردی لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و کاریگـەری سـەرکردە و سروشـتی جوگرافیـا لـە هێنانـە کایەی دەسەڵاتی ڕامیاری لە ناوچە کوردنشینەکاندا و پەیوەست بوونیان بە بنـەما سیاسـی و فەلـسەفییەکانی سـەرهەڵدان و ڕووخـانی دەوڵـەت، ئـەوە دەروازەیەکی بنچینەیی بوو، بۆ ئەوەی لەسەر ئەم بابەتە بنووسین.

جگـە لـەوە ئـارەزووی خۆمـان بـۆ توێژینـەوە لەسـەر مێـژووی کـورد لەسەردەمی خەلافەتی عەبباسی و ئـەو دەسـەڵاتە سیاسـییە کوردیانـەی کـە لەو ماوەیەدا سەریانهەڵدا پاڵنەرێکی تربوو، هەروەها بۆ ئاشنایی بـە وەڵامـی ئەو پرسیارە بۆچی نیشتمانی کورد بە درێژایی مێژووی سەردەمی عەبباسـی دەسـەڵاتێکی سیاسـی یـەکگرتووی نـەبووە؟ لەلایـەکی تـر لێکۆڵینـەوە لـەو بابەتە بەو پێیەی ببێتە مایەی زیادبوونی هۆشیاری سیاسیمان لەبارەی کورد کـە چـەندە بووینــە بەربەسـت لــە بــەردەم ئامانجــە درێژخایەنــەکان و بەردەوامیدان بە دەسەڵاتی سەربەخۆ.

ئەگەر ئەو توێژینـەوە دیـدێکی رەخنـەگری پێـوە دیاربێـت، تـەنها بـۆ ئەوەیە کە کورد سوودمەندبێت لە ڕابـردووی خـۆی و بـە شـێوازێکی زانـستی ڕاستییە مێژووییەکان بخەینە ڕوو، بێگومان توێژەری کورد ڕەخنەی بنیاتنەر

لە مێژووی خۆی بگرێ، باشترە لەوەی کە بێگانە و دوژمن ڕەخنـە و تـوانجی ئاراستە بکەن.

توێژینەوەکـەمان تـەنها لەسـەر شـەش میرنـشینی کـورد کـراوە، کـە لەسـەردەمی دەوڵـەتی عەبباسـیدا سـەریانهەڵداوە و هـەر لـە چوارچـێوەی دەوڵـەتی عەبباسـی و سـەردەمی فـەرمانڕەوایی سـەلجوقییەکاندا ڕووخـان، چـونکە هەنـدێك میرنـشینی ترمـان هـەبووە، لـە دوادواییـەکانی خەلافـەتی عەبباسـیدا دەرکـەوتن، بـەڵام لـەو ماوەیـەدا نـەڕووخان، وەکـو میرنـشینی شوانکارە و فضلوی و خورشیدی، کە ئاماژەم پێیان نەکردووە، لەبەر ئەوەی توێژینەوەکـەمان شـێوازێکی راڤـەیی مێژووییـە ئـەو چـەند میرنشینەی کـە باسمان لێوەکردوون، تەنها وەك نموونـە هێناومانەتـەوە، کـاری ئێمـە بریتـی نییە لە باسکردنی تەواوی میرنشینەکان.

لێرەدا بە پێویستی نازانین باس لەوە بکەم کـە کۆسـپ و تەگـەرەمان هاتۆتە پێش و زحمەتم کێشاوە، بـەڵکو تـام وچـێژی باسـەکە لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە، کـە شـەو نخـوونی و هـەوڵ وکۆشـش و تێکوشـانی لـە پێنـاودا بکەی، هیچ توێژینەوەیەك نییە کە زەحمەتی و ماندوبوونی نەوێ، بەتایبـەتی ئەگەر سەرچاوەو ژێدەری هاوشێوەی زمانی نووسینەکە دەگمەن بێت.

لـە نـاوەرۆکی کتێبەکـەدا نـاوی کەسـایەتییە کانمـان وەکـو خـۆی بـە ڕێنووسی عەرەبی هێشتۆتەوە، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی درێژ نووسینی ناوەکان نەبینەوە، هەروەها ئەو نووسەرانەی کـە زیـاتر لـە کتێبێکمـان بـەکارهێناوە، دووبارە ئاماژەمان بە ناوی کتێبەکەی کردۆتەوە، بەڵام بـە کـورتکراوەیی بـۆ ئاسانکاری و تێکەڵاو نەبوون.

سروشتی توێژینەوەکـە وای خواسـتووە کـە بـۆ سـێ بەشـی سـەرەکی دابەش بێت، لێرەدا بە کورتی هەریەکەیان دەخەینە ڕوو.

بەشـی یەکـەم بـاس لەبەراییـەکانی دەوڵـەتی عەبباسـی دەکـات ئـەو رەوشە ناجێگیرەی کە ڕووبەڕووی خەلافـەت ببـۆوە، هـەر لـە کوشـتنی (ابـو مـسلم)ی خوراسـانی کـە کاردانـەوەی لەسـەر دەرکـەوتنی بزووتنـەوە

بەرهەڵستیکارو هەڵگەڕاوەکانی دژ بە دەسەڵاتی مەرکەزی هەبوو، لەگەڵ ئەوەش ئاماژەمان کردووە بەو کەسایەتیانەی کە سەرکردایەتی ئەو گرووپە یاخیگەریانەیان دەکرد، کە نائارامی و پەشێویان بۆ دەوڵەت دەنایەوە، هەروەها شەڕوململانێی نێوان (الامین) و (المامون)ی برای لەسەر بەدەستهێنانی کورسی دەسەڵات و سەرکەوتنی (المامون) لە شەڕی براکوژیدا کە سەروەت و سامانێکی زۆری دەوڵەتیان بە فیڕۆدا، هەروەها دەرکەوتنی بزووتنەوەی بابەکی خوڕەمی کە پانتایەکی فراوانی لە هەرێمی ئازربیجان و رۆژئاوای هەرێمی چیا گرتبۆوە، مەترسییەکی زۆری لەسەر خەلافەتی عەبباسی دروست کردبوو.

لە پاشان باس لە هەرێم و ناوچە کوردنشینەکان دەکرێت بەر لە سەرهەڵدانی میرنشینەکان کە تەنگژەیەکی سیاسی ڕووی تێکرد بوون، بەهۆی لاوازی حکومەتی ناوەندی، ئەو ناوچانە ببوون بە جێگەی ململانێی هێزە زاڵبووەکانی وەك حەمدانییەکان و بوەیهییەکان و زیارییەکان و دەیسەمی کوردی، کە هەریەکەیان هەوڵیدەدا بۆ سەپاندنی دەسەڵات و فراوان کردنی پێگەی جوگرافی خۆی، لەو نێوەندەدا خێڵە کوردییەکان توانیان لە سنوورێکی دیاری کراو دەسەڵاتێکی تایبەت بە خۆیان ڕابگەیەنن، وەك شەدادییەکان لە ئاران و رەوادیەکان لە ئازربیجان و لە رۆژئاوای هەرێمی چیا حەسنەویهی و عەنازییەکان دەرکەوتن، لە وڵاتی جەزیرە میرنشینی مەروانی سەریهەڵدا، لە هەولێر هەزبانییەکان میرنشینێکیان دامەزراند.

بەشی دووەم: تەرخانکراوە بۆ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی میرنشینەکان لە سەرەتادا باس لە فاکتەرە ناوخۆیەکان دەکەین، بەر لە هەموو شتێك ویستی سەربەخۆیی تاکی کوردی لەم بوارەدا رۆڵی خۆی نواندووە، کۆمەڵگەی کوردی بەو پێیەی کە پێکهاتەیەکی خێڵەکی هەبوو بۆیە خێڵ وەك یەکەیەکی سیاسی و ئیداری و سەربازی بە سوود وەرگرتن لەو کایە کۆمەڵایەتییە توانیویەتی ببێت بەبنیاتنەری دەسەڵات، بە پاڵپشتی و کارامەیی سەرکردەی کارێزما، کە پێکهاتەی جوگرافیای هەرێمە

کوردنشینەکان سروشتێکی لە باری هەبووە، چیا سەخت و ناوچە دژوارەکان پەناگەیەکی بەهێزی بەرگری بووینە، سەرەڕای زۆری قەڵای پتەو و بەهێز هاوکات داهات و بەروبوومی هەرێمە کوردنشینەکان وەك ژێرخانێکی ئابووری و بنەمایەکی سەرەکی بوون بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات.

فاکتەرە دەرەکییەکان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر جاڕدانی سەربەخۆیی دەسەڵاتی کوردی هەبووە، لە پێش هەموویانەوە لاوازی دەوڵەتی عەبباسی، کە ئەو هێز و توانایەی نەبوو، تەواوی ناوچەکان کۆنترۆڵ بکات و بەڕێوەببات بە هۆی گێرۆدەیی بە کێشە ناوخۆییەکان، خەلیفە تەنها بەناو فەرمانڕەوایی دەکرد، بەڵکو تورکەکان دەستیان بەسەر مەرکەزی خەلافەت داگرتبوو، تا ئەو ڕادەی حکومەتی مەڵبەند سەرقاڵ بوو، بە تەنگژە ناوخۆییەکان دەسەڵاتی نەدەپرژا بەسەر هەرێمەکانی دەوروبەریدا، ئەوە بواری لەبەردەم سەرانی کورد خۆشکرد چەند میرنشینێکیان دامەزراند لە چوارچێوەی هەرێمی خێڵایەتییەکانیان، بۆبەرگری کردن لەسنووری خەلافەت بەرامبەر بە هێزە نا ئسلامیەکان و پاراستنی ناوچەکوردنشینەکان لە هەر هەرەشەو مەترسیەك کە ئاراستەیان بکرێت.

سەرەڕای ئەوەی کە دیاردەی جیاخوازی جەستەی خەلافەتی عەبباسی داگرتبوو، هەر هێزەو لە ناوچەیەکەوە سەری هەڵدەدا جیابوونەوەی خۆی ڕادەگەیاند وەك ئومەوییەکان لە ئەندەلوس و تاهیریەکان لە خوراسان و تۆلۆنیەکان لە میسر... هتد.

هەروەها دەرکەوتنی بوەیهییەکان لەسەر شانۆی سیاسی و دەستگرتنیان بەسەر بەغدا لەساڵی(٣٣٤ك/٩٤٥ز) گۆڕانێکی تری لە واقعی سیاسی ناوچەکان هێنا ئاراوە کە لەڕووی مەزهەبی ئاینی و مامەڵەی سیاسی جیاوازییان هەبوو لەگەڵ عەبباسییەکان.

بەشی سێیەم: تایبەتە بە هۆکارەکانی ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان دەکات لە فاکتەرە ناوخۆییەکان دەست پێدەکات، کە شەڕ و ململانێی بنەماڵەی دەسەڵاتدار لەسەر بە دەستهێنانی کورسی فەرمانڕەوایی و

سەپاندنی دەسەڵاتی تاکڕەوی خۆیان بناغە و بنچینەی میرنشینەکانی لەرزۆك کردبوو، تا ئەو ڕادەیەی ویستی حوکمداری وای لە میرە کوردەکان کردبوو، دەستکێشی بێگانە بکەن بۆ سەرخاك و وڵاتی خۆیان و پشت بەهێزی دەرەکی ببەستن بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشە ناوخۆیەکان سەرەڕای نەبوونی گیانی یەکگرتووخوازی لە نێوان میرنشینەکاندا، بە پێچەوانەوە دژایەتی و بەربەرەکانی کردنی یەکتری ئیرادەی بەرگری کردنیان لا پووکابۆوە، عەقڵیەتی خێڵایەتی و پەیوەست بوون بە بنەمای خێڵگەری جێگەی سۆزی نەتەوە و هاوزمانی نەهێشت بۆوە، جگە لەوەش کردار و ڕەفتاری هەندێك لە میرە کوردەکان هێزی میرنشینەکەی سستکرد و دەرئەنجامەکەی بێهێزی و لاوازی لێکەوتەوە، هەندێك جار سیستەمی پشتاوپشت فاکتەرێك بووە بۆ هاتنە سەردەسەڵاتی میرێك کە شایستەی فەرمانڕەوایی نەبێ، تێکڕای ئەو تەنگژە و بارگرژی و هەلومەرجە ناوخۆیانە دەروازەیەك بوون بۆ هاتنی هێزێکی دەرەکی وەك سەلجوقییەکان بۆ سەر نیشتیمانی کورد، هەروەها زۆری شەڕ و ململانێی میرنشینە کوردییەکان لەگەڵ هێزە هاوسنوورییەکانیان توانای سیاسی و ئابووری و سەربازی میرنشینەکانی لەبار بردبوو.

لە ئاکامی تێکڕای ئەو فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکیانە کۆتایی بە دەسەڵاتی سیاسی قەوارە کوردییەکان هات لەسەر شانۆی ڕووداوەکان.

لە کۆتایی ئەو باسە جگە لە دەرئەنجام هەندێك پاشکۆ لە خۆدەگرێت کە پەیوەستن بەبابەتی لێکۆڵینەوەکە لە ڕووی زنجیرەی میرە فەرمانڕەواکان لەگەڵ نەخشەی هەرێمە کوردییەکان لەسەردەمی دەوڵەتی عەبباسیدا، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ناڵێین لێکۆڵینەوەکەمان بێ کەم و کوڕییە، بەڵام ئومێدەوارم هەوڵ و کۆششەکانمان بەرهەمداربێت توانیبێتمان هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی بخەینە بەردیدی خوێنەران و ببێتە مایەی زیاد بوونی بەشێك لەزانیاری لە کتێبخانەی کوردی.

## هەڵسەنگاندنی سەرچاوە بنچینەییەکان

ئەو توێژینەوەیە ئامادەکراوە لەسەر بنەمای پشت بەستن بە کۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراوجۆر و بەکارهێنانی ژێدەری جیاواز و کتێبێکی فەلسەفی و مێژوویی کە هەریەکەیان سوودی تایبەتی خۆی هەبووە، بەڵام لێرەدا ئاماژە بەو سەرچاوە و ژێدەرانە دەکەین کە ڕۆڵی سەرەکییان هەبووە.

**یەکەم/ سەرچاوە عەرەبییەکان.**

هەندێك لە سەرچاوە عەرەبییەکان گرنگیان داوە بە باسکردنی ڕووداو و بارودوخی ناوچە کوردنشینەکان و لە پێگە و دەسەڵاتی میرە کوردەکان دواون لە چوارچێوەی میرنشینەکانیاندا، یەکێك لە سەرچاوە بنچینەییەکان کە گرنگییەکی یەکجار زۆری بۆ توێژینەوەکەم هەبوو کتابی (تجارب الامم)ی (مسکویە، م ٤٢١ك/١٠٣٠ز) کە خۆی نزیك بووە لە ڕووداوەکان و قسە و باسی زۆری هەیە لەسەر ناوچە کوردنشینەکانی ئازربیجان و ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، بە شێوەیەك کە سەرچاوەکانی تر ئاماژەیان پێنەداوە.

(الفارقي، م پاش ٥٧٧ك/١١٨١ز) بە کتێبی (تاريخ الفارقي) ئاشنامان دەکات کە یەکێکە لە سەرچاوە بە هێز و سوود بە خشەکانی مێژووی میرنشینی مەروانی تایبەتمەندییەکانی ئەو کتابە لەوەدایە کە بەدرێژی ئاماژە بە باس و خواس و سەرگورشتەی میرەکانی مەروانی دەکات کە لە سەرچاوەکانی تردا بەدیناکرێت، سەرەڕای ئەوەش مێژوونووس خۆی خەڵکی میافارقینە نزیك بووە لە ڕووداوەکان باوك و باپیریشی هاوسەردەمی میرنشینەکە و تێکەڵی ڕووداوەکان بووینە، ئەوە وای کردوە، کە زانیاری زۆر وردی هەبێت سەبارەت بە فەرمانڕەوایی مەروانییەکان.

بەهەمان شێوە (ابن الأثیر، م٦٣٠ك/١٢٣٢ز) لە کتێبە بەناوبانگەکەی (الكامل فى التاريخ)دا باس و خواسی زۆری لەسەر کوردان هەیە، سەرچاوەیەکی سەرەکی و بنچینەیە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد لە ماوەی دەوڵەتی عەبباسیدا لە نێوانیشیاندا میرنشینە کوردییەکان. کە بە

درێژی باس لە میرەکانی حەسنەوەیهی دەکات و عەنازییەکانیشی فەرامۆش نەکردوە و لێدوانی لەسەر مەروانییەکان هەیە، دەقی گرنگی هێناوەتەوە لەسەر هەزبانییەکان و رەوادی و شەدادییەکان تەنانەت زۆر بە ڕوونی ئاماژە بە هاتنی هۆزی غوز دەکات بۆ هەرێمە کوردنشینەکان، ئەو کاولکاری و تالآنەی کە ئەنجامیاندا لە ناوچە جیاجیاکان، هەروەها لە کتێبێکی تری بەناوی(الباهر فی الدولة الاتابكية بالموصل) زانیاری دەگمەنمان دەداتێ، بۆیە هەر توێژینەوەیەك لەسەر کورد و قەوارە سیاسییەکانی بنووسرێ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە شێوەیەکی بەرچاو زانیاری بەخش نابێت بەبێ بەکارهێنانی کتێبەکانی ئەو مێژوو نووسە ناوداره.

هەروەها (ابن شداد، م ٦٨٤ك/١٢٨٥ز) لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی بە ناوی (الاعلاق الخطيرة)دا لێدوانی زۆری هەیە لەسەر مەروانییەکان، لەگەڵ ئەوەی تا ڕادەیەك دوورترە لە (الفارقي) لە رووی شوێن و کاتەوە، بەلآم زانیارییەکانی وەك راستبینی و پاڵپشت وایە بۆ ئەو مێژوونووسە جگە لەوەش هەندێك دەقی تێدایە کە لە (تاريخ الفارقي)دا بەرچاوناکەوێت.

(ابن خلدون، م ٨٠٨ك/١٣٠٧ز) لە کتێبەکەی بە ناوی (تاريخ ابن خلدون) یاخود بە (كتاب العبر فی ديوان المبتدأ والخبر) ناو دەبرێت زانیاری ورد و گرنگمان پێدەبەخشێ لەسەر هەندێك لە میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی دەوڵەتی عەبباسی، هەروەها کتێبێکی تری کەبە (المقدمة) بەناوبانگە لە ناوەرۆکدا بیرو بۆچونی رێك سەبارەت بە دەوڵەت دەخاتە ڕوو، بنەمای دەمارگیری بە فاکتەرێکی گرنگی سەرهەڵدانی ناوزەند دەکات، ئاماژە بەو هۆکارانە دەدات کە ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە لاواز بوون و ڕووخانی دەوڵەت، ئەو بەرهەمەی لە بواری فەلسەفەی مێژوودا بە کتێبێکی سودمەند و یەکجار گرنگ دادەنرێت، کە تێیدا سەرنج و تێڕامانی زۆر دەردەخات.

لێرەدا ناکرێت هەموو سەرچاوەکان بخەینە روو، لەبەر ئەوەی ناوی هەموویان لە لیستی سەرچاوەکان لە کۆتایی توێژینەوەکە هاتووە.

**دووەم/ سەرچاوە و ژێدەرە فارسییەکان.**

بۆ ئامادە کردنی ئەو توێژینەوەیە سوودمان لە هەندێك سەرچاوە و ژێدەری فارسی وەرگرتووە، کە تاڕادەیەکی زۆر بوو بە هۆی دەوڵەمەند بوونی باسەکە تەنانەت دەتوانین بڵێین بەبێ بەکارهێنانی هەندێکیان توێژینەوەکە تەواو زانیاری بەخش نە دەبوو، وەك کتێبی (تاريخ گزيده) کە دانەرەکەی (حمدالله مستوفي، م٧٥٠ك/١٣٤٩ن)یە کە لە مێژووی ئیسلام دەدوێت باس لە هێزە سیاسییەکانی ئەوکات دەکات بە تایبەتی بوەیهیی و سەلجوقییەکان لەو نێوەندەدا لێدوانی هەیە لەسەر میرە کوردەکان بە تایبەتی حەسنەوەیهی و عەنازییەکان.

هەروەها کتێبی (شهر ياران گمنام) کە نووسەرەکەی (أحمد كسروى) یە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کتێبە سەرچاوەیەکی بنچینەیی نییە ژێدەرێکی هاوچەرخە، بەڵام زانیاری زۆر گرنگی لە خۆ گرتووە سەبارەت بە میرنشینی رەوادی و شەدادییەکان کە بەشێوەیەکی تێرو تەسەل ئاماژە بە یەکە یەکەی میرەکان دەکات لە نووسینەکانیدا پشتی بە سەرچاوە ئەرمەنییەکان بەستووە، بۆیە کتێبێکی پڕ بایەخە بە شێوەیەك دەقەکانی لە سەرچاوە ئیسلامییەکان بەرچاو ناکەوێت.

(بابا مردۆخ روحانی) خاوەنی کتابی (تاريخ مشاهير کرد)ە کە یەکێکە لەو ژێدەرانەی کە بۆ ئەم توێژینەوەیە سوودێکی زۆرمان لێ بینیوە، چونکە مێژوونووس باس لە زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی دەوڵەتی عەبباسی دەکات بە تایبەتی ئەوانەی دەکەونە چوارچێوەی باسەکەی ئێمە، کە قسە و باسی زۆری هەیە لەسەر شەدادییەکان و ئاران و روادیەکان لە ئازربیجان و میرنشینەکانی تریشی فەرامۆش نەکردووە لەووانیش دواوە.

**سێیەم/ ژێدەرە عەرەبی و کوردییەکان.**

لەنووسینی ئەم توێژینەوەدا سوود لە گەلێك ژێدەری گرنگی بە زمانی کوردی و عەرەبی وەرگیراوە، هەرچەندە ئەو ژێدەرانەش پشتیان بە کۆمەڵێك سەرچاوەی رەسەن و بنچینەیی بەستووە بۆ باسەکانیان، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەم ژێدەرانە گرنگ نەبن، بەڵکو گەلێك شیکردنەوە و دەرئەنجامی باشیان لە نووسینەکانیاندا دەرخستووە لەسەر بنەمای لێکدانەوەی دەقە مێژوویەکان کە لە خودی سەرچاوەکان بەدی ناکرێ، لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، لە هەموویان گرنگتر شەرەفخانی بەدلیسییە کە کتێبەکەی بە ناوی (شەرفنامە)یە بە سەرچاوەی مێژووی کورد دادەنرێت کە تێڕوانین و لێدوانی زۆری هەیە سەبارەت بە کورد و میرەکانی.

هەروەها (محمد أمين زكي) لە (تاريخ الدول والأمارات الكوردية) باس لە زۆربەی زۆری میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی دەوڵەتی عەبباسی دەکات، (حسين حزني) لە کتێبەکەی(کوردستانی موکریان) و (أورێکی پاشەوە) زانیاری سوود بەخشی لەسەر ناوچە کوردنشینەکان و میرنشینە کوردییەکان بە خشیوە، بە دڵنیایەوە کتێبەکەی (عبدالرقيب يوسف) پڕبایەخە لەسەر (الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى) کە خۆی لە دووبەش دەنوێنێ یەکیان سیاسییە و ئەوەکەی تریان شارستانییە، تێیدا باس لەسەرجەم بوارەکانی میرنشینی مەروانی دەکات.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا نابێت ڕۆڵی توێژینەوەی کورد و ئەو نامە زانکۆییانەی کە نووسراون لەبیر بکەین کە لە مێژووی میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی عەبباسی دواون، لەسەرووی هەموویانەوە (حسام الدين النقشبندي) لە نامە ماستەرەکەیدا (الكرد فى الدينور وشهرەزور) باسێکی پڕ بایەخی لەبارەی میرنشینی حەسنوەیهی و عەنازییەکان نووسیوە و لە تەواوی مێژووی ئەم دوو میرنشینە دواوە و باس لە هەڵسوکەوت و سیاسەت و عقڵیەتی میرەکانی دەکات یەك بە دوای یەك کە دەسەڵاتیان وەرگرتووە،و پەیوەندی لەگەڵ بوەیهییەکان دەخاتە روو، ناوبراو سەرچاوەی زۆر

دەگمەنی بەکارهێناوە، هەروەها لە دکتۆراکەی لەسەر (أذربيجان) لە ساڵانی (٤٢٠- ٦٥٤ك/ ١٠٢٩- ١٢٥٦ز) بەدرێـژی بـاس لـە هێرشـەکانی هـۆزی غـوز دەکـات بۆئـەم هەرێمـە لەگـەڵ ئـەو کـردارو رەفتارانـەی بەرامبـەر بەخـەلك ئەنجامیانـــدا ئامـــاژە میرنـــشینی رەوادیـــش دەکەوێتـــە چوارچـــێوەی توێژینەوەکەی کە ئێمە سوودی زۆرمان لێ وەرگرتوە.

، هەروەها (محمود ياسين التكريتي) لە نامەی ماستەرەکەیدا بە نـاوی (الأمارة المروانية في دياربكر والجزيرة)، پەیوەندی میرنشینی مـەروانی لەگـەڵ سـەرجەم هێزەکـانی هاوسـەردەمی خـۆی روون دەکاتـەوە، زانیـاری سـوود بەخشی تێدا بەدی دەکرا.

بە هەمان شێوە (فرست مرعي)لە نامەی دکتۆراکەی بە ناوی (الأمارات الكردية في العصر العباسـي الثـاني) کـە بـاس لـە میرنـشینی حەسنەوەیهی و عـەنازی و مەروانییـەکان دەکـات وەك سـێ میرنـشینی کـوردی سـەردەمی دەوڵەتی عەبباسی، هەروەها ماستەر نامەی (اسماعيـل شـكر رسـول)بـەناوی (الشداديون فى بلاد اران) کە بەتێرو تەسەلی باس لەمیرنشینی شەدادی دەکات ئامـــاژە بـــە جـــۆری پەیوەنـــدی ئەومیرنـــشینە دەدات لەگـــەڵ هێـــزە هاوسنوورەکانی، وە نامەکـەی (احمـد عبـدالعزيز) لەسـەر (الأمـارة الهذبانيـة الكردية) لێکۆلینوەیەکی سیاسی وشارستانیە لەمیرنشینی هەزبانی لە سالانی (٢٩٣- ٦٥٦ك/٩٠٥- ١٢٥٨ز) کەتیـــدا زانیـــاری ســـوود بەخـــشمان پـــێ دەبەخشێ و سەرچاوەی زۆری بەکارهێناوە، هـەروەها نامـەی ماسـتەرەکەی (قادر محمد حسن) بەناوی (الامارات الكردية فـى العهـد البـويهـي)کـە زانیـاری سوود بەخش لەخۆگرتووە، لـە زۆر بـواردا لـە میرنـشینە کوردییـەکان دواوە، ئێمەش لەم توێژینەوەیەدا سوودمان لە بیرو بۆ چوونەکانی وەرگرتووە.

جگە لەوانەش کۆمەڵێك کتێب و ژێدەری بـە نـرخ سـوودمان لێبینیـوە، کە هەر یەکەیان لە شوێنی خۆی بەکارمان هێناوە.

# بەشی یەکەم

## بارودۆخی سیاسی دەوڵەتی عەبباسی و هەرێمە کوردنشینەکان پێش سەرهەڵدانی میرنشینەکان.

### تەوەرەی یەکەم

- تێروانینێك بۆ بارودۆخی دەوڵەتی عەبباسی یەکەم

### تەوەرەی دووەم

- بارودۆخی سیاسی هەرێمە کوردنیشینەکان بەر لە سەرهەڵدانی میرنشینەکان

### تەوەرەی سێیەم

- ناساندنی میرنشینە کوردییەکان

١- میرنشینی حەسنەوەیهی
٢- میرنشینی شەدادی
٣- میرنشینی رەوادی
٤- میرنشینی مەڕوانی
٥- میرنشینی عەنازی
٦- میرنشینی هەزبانی

## تەوەرەی یەکەم

## تێڕوانینێك بۆ بارودۆخی سیاسی سەردەمی عەبباسی یەکەم

هەڵسەنگاندنی بارودۆخی سیاسی دەوڵەتی عەبباسی هەر لەسەرەتاوە پێشینەیەکی پێویستە بۆ تێگەیشتنمان لەلاوازی خەلافەت، چونکە بێگومان هیچ دەوڵەتێك لەناکاو لاواز نابێت، دەبێ لەسەرەتادا کۆمەڵێك گۆڕانکاری و فاکتەر هەبێ کە دەرئەنجامی لاوازی لێدەکەوێتەوە، لاوازی دەوڵەتی عەبباسیش یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی دەرکەوتنی میرنشینە کوردییەکان.

ئەو دەوڵەتە دوای لەناوبردنی دەوڵەتی ئومەوی لەساڵی (١٣٢ك/٧٥٠ز) هاتە سەر دەسەلات[١]. کە (أبوالعباس السفاح) یەکەم خەلیفەی بوو[٢]. سەرەتای دیاردەی ناجێگیری ئەم دەوڵەتە لە کوشتنی (أبوسلمه‌الخلال) یەکەم وەزیر لەلایەن (أبو العباس السفاح)[٣] دەردەکەوێت، بەڵام بزووتنەوەی فکری و هەڵگەڕاوەکان بەتەواوی لەسەر دەمی خەلیفە (أبو جعفر المنصور)دا دەرکەوتن کەکاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بەفیڕۆدانی هێزی دەوڵەت لەڕووی ماددی و مرۆییەوە.

کاتێك (أبو جعفر المنصور) دەسەلاتی گرتەدەست بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستی لەلایەن مامیەوە (عبدالله کوڕی علي) سەریهەڵدا کە کەسایەتییەکی بەناوبانگ بوو لەڕووی سەربازی و سیاسییەوە داوای

---

١- ابن خياط، تاريخ خليفة بن خياط، تحقيق، مصطفى نجيب فواز، حكمت كيشلى خواز، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٥، ص ٢٦٧.

٢ - اليعقوبى، تاريخ اليعقوبى، تحقيق، خليل المنصور، الطبعة الثانية، دارالكتب العلمية، بيروت ٢٠٠٢، ج٢، ص ٢٤٣

٣ - ابن قتيبة الدينوري، الامامة و السياسه، تحقيق، على شيرى، دار الأضواء، بيروت ١٩٩٠، ج٢، ص١٦٥-١٦٦. ابن عبد ربه، كتاب العقد الفريد، تحقيق، البركات يوسف هبود، دار الأرقم بن ابى الأرقم، بيروت ١٩٩٩، ج٥، ص١٠٢.

خەلافەتی دەکرد[1]. کە دەسەڵاتدار بوو بەسەر شام و زۆربەی خەڵکی شام متمانەی خەلافەتیان پێبەخشی[2].

بەوەش جیابوونەوەی خۆی لە دەسەڵاتی مەرکەزی راگەیاند، بۆیە (المنصور) سوپایەکی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی (ابو مسلم الخراساني) بۆ بەرهەڵستی کردن و رووبەڕوو بوونەوەی مامی،سەرئەنجام لەشاری نصيبين[3] بەیەك گەیشتن لەم شەڕەدا شامییەکان شکان و (عبدالله) بۆ شاری بەسرا هەڵات [4].

دواجار لەلایەن (المنصور) دەستگیر کرا وە لەزیندان ماوە تامردن[5]. بێ گومان ململانێ لەسەر خەلافەت رەنگ دانەوەی خراپی لەسەر سەرخانی ئەم دەوڵەتە هەبوو، هەرلەو کاتە دا (المنصور) هەوڵیدا (ابومسلم) دووربخا تەوە بۆ میسر و شام[6] کە فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە

---

١ - الأزدي، ، تاريخ الموصل، تحقيق علی حبيبة، دار التحرير، القاهرة ١٩٦٧، ص١٦١، كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة، بنيامن فارس و منير البعلبكى، الطبعة الخامسة، دار العلم، بيروت ١٩٦٨، ص١٧٥.

٢ - البلخى، البدء والتاريخ، وضع حواشيه، خليل عمران المنصور، دار الكتب العلميه، بيروت ١٩٩٧، ج٢، ص٢٧٧. المسعودى، مروج الذهب، تحقيق، محمد هشام النعسان و عبدالمجيد طعمة حلبى، دار المعرفة، بيروت ٢٠٠٥، ج٣، ص٢٧٥. الذهبي، تاريخ دول الاسلام، الطبعة الثانية، مطبعة جمعية دائرة المعارف العثمانيه، حيدر اباد ١٩٤٤، ج١، ص٦٦.

٣- نصيبين، شارێکە لە وڵاتی جەزیرە دەکەوێتە سەر رێگای کاروانی موسل و شام. ياقوت الحموى، معجم البلدان، دارصادر، بيروت (د.ت) ج٥، ص٢٨٨.

٤- ابن خياط، م. س، ص٢٧٢. الطبرى، تاريخ الامم والملوك، تحقيق، مصطفى سيد، طارق سالم، المكتبة التوفيقية، القاهرة (د.ت)ج٤، ص ٤١٢-٤٧١٤. خالد عزام، موسوعة التاريخ الإسلامى العصر العباسى، دار أسامة للنشرو التوزيع، الأردن- عمان ٢٠٠٣، ص٦٢.

٥ - أبن العديم، زبدة الحلب من تاريخ حلب، وضع حواشيه، خليل المنصور، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٦م، ص٢٤. محمد الخضري بك، الدولة العباسية، اعتنى به، درويش جويدى، المكتبةالعصرية، بيروت ٢٠٠٥، ص٥١.

٦ - البلاذري، جمل من أنساب الاشراف، تحقيق، سهيل زكار، رياض الزركلى، دارالفكر، بيروت ١٩٩٦، ج٤، ص٢٦٨، بروكلمان، س.پ، ص١٧٦، خليل إبراهيم السامرائى، طارق فتحى سلطان، تاريخ الدولة العربية الاسلامية فى العصر العباسى، موصل ١٩٨٨، ص٢٢.

بگرێتـه ئەسـتۆ، ئەمەشـی بـۆ نەهێـشتنی ئـەو مەترسـیانەی کەهــەیبوو بەرامبەر (ابو مسلم) له خوراسان[1] له رووی هێزو بنکـەی جەماوەرییـەوه لایــەنگیری کردنــی خــەڵکی خوراســان بــۆی، جگــه لــەوەش (المنــصور) نێردراوێکی نارد بۆ سـەرژمێریکردنی ئـەو دەسـکەوتانەی کـه (ابـو مـسلم) بەدەستی هێنابوو لەسەروەت و سامان لەشـام ئـەو کرداره (ابـو مـسلم)ی تــووڕەکردوو گەڕایــەوه خوراســان[2]. بەمــه ئاراســتەی رووداوەکــان بـەرەوخراپی هـەنگاوی نـا و کێشەکانی قـوڵتر کـردەوە، دەرئەنجامەکـەی کوشتنی (ابو مسلم الخراسـاني) لێکەوتـەوە[3]، ئـەوەش هۆکارێـك بـوو بـۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوە هەڵگەڕاوەکان له هەرێمی خوراسان.

دەرکەوتنی کەسایەتی (سنباذ) کـه یـەکێك بـوو لەشـوێن کـەوتوانی (ابـو مسلم)[4]، بەشـێکه لـەو بزووتنەوانـه کـه لەسـاڵی (١٣٧ك/٧٥٤ز)[5] لەنیـسابور، راگەیاندرا داوای خوێنی (ابو مسلم) یان دەکرد[6]. توانیان دەست بگرن بەسەر شارەکانی قومس و ئەسفەهان و رەی کەزۆربـەی شـوێنکەوتووانی خـەڵکی چـیا

---

١ - خوراسان، ولاتێکی بەناوبانگه له رۆژهەڵاتی ئەودیوی رووبارو رۆژئـاوای قهستان چـەند شـارێك لـه خـۆدەگری وەکـو هـیرات، بلـخ و نیـسابوور کەخاکەکـەی زۆر بـه پیـت و بەرەکەته، القزويني، أثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر، بيروت ١٩٩٨ ، ص٣١٦.

٢ - اليعقـوبي، تـاريخ اليعقـوبي، ج١، ص٢٥٦. ابـن اعـثم الكـوفي، (كتـاب الفتـوح) دار النـدوه، بيروت(د. ت)، ج٨، ص٢١٩.

٣ - الجاحظ، البيان و التبيين، تحقيق، علي ابو مـسلم، دار مكتبـة الهلال، بـيروت ٢٠٠٥م، ج٣، ص٢٤٠. ابوحنيفـه الـدينوری، الأخبـار الطـوال، تحقيـق، عبـدالمنعم عـامر، القـاهرة ١٩٩٠، ص٣٨٢.

٤- ابن الطقطقي، الفخري فـی الاداب الـسلطانية والـدول الأسـلامية، دار صـادر، بـيروت ١٩٦٦، ص١٧١، فاروق عمر فوزی، الخلافة العباسية، عصر القوة و الإزدهار، دار الـشروق للنـشر والتوزيع، عمان-الاردن ٢٠٠٢، ص ١٠٦.

٥ - الطبري، م. س، ج٤، ص٤٢٤، ابن كثير، البداية والنهاية، تحقيـق، حامـد احمـد الطـاهر، دار الفجر للتراث، القاهرة ٢٠٠٣، ج١٠، ص٨١.

٦- اليعقوبی، تاريخ اليعقوبی، ج٢، ص٢٧٥. المسعودی، مروج الذهب ج٣، ص٢٧٩.

بوون[١]. سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا کەتێیدا بیرو باوەڕی زەردەشتی[٢] و مەزدەکی[٣] و شیعەی لە خۆگرتبوو بۆ بەرانگاربوونەوەی خەلافەتی عەبباسی[٤]. دواتر بەرەو هەمەدان کەوتنەڕێ، بەڵام (المنصور) هێزێکی دەهەزار جەنگاوەری بەسەرکردایەتی (جهور کوڕی مرار) نارد بۆ لەناوبردنی (سنباذ) شوێنکەوتووانی دوای شەرێکی توند بەکوشتنی (سنباذ) و شکست خواردنی لایەنگرانی بزووتنەوەکە کۆتایی هات[٥]. هەروەها بزووتنەوەی (ئیسحاق تورك)ی[٦] دوای کوشتنی( ابو مسلم) هەڵگەرانەوەی خۆی لەناوچەی خوراسان لەساڵی (١٣٧ك/٧٥٤ز) ڕاگەیاند، ئەم بزووتنەوەیە تا ساڵی(١٤٠ك/٧٥٧ز) درێژەی کێشا کەلەوماوەیەدا ئەم هەرێمە بارودۆخێکی شڵەژاو و توندی بەخۆیەوە بینی[٧].

---

١ - ابن الأثير، الكامل فى التاريخ، تحقيق، عمر عبدالسلام تدمري، دار الكتاب العربى، بيروت ٢٠٠٦م.ابن كثير، م. س، ج١٠، ص٨١.

٢ - زەردەشتی، ئەوانە هاوەڵ و شوێن کەوتووی زەردەشت کوری یورشب بوون لە سەر دەمی پاشا کشتاسب لە ئیران دەرکەوت وەك پەیام مبەرێك کە خاوەنی کتێبی ئاوێستایە. الشهرستانى، الملل والنحل، تحقيق، امير على مهنا، على حسن فاعور، الطبعة الثانية، دار المعرفه، بيروت ١٩٩٢، ج١، ص٢٨١-٢٨٤

٣ - مەزدەکی، کەسایەتییەکی ئاینی بوو لە ئیران لە سەردەمی (قوباد کوری فیروز) دەرکەوت بەر لە ئیسلام کە داوایی یەکسانی دەکرد لە نێوان خەڵك لە ماڵ و سامان و ئافرەتدا لە سەر دەمی (نیوشێروان) کوژرا. البغدادى، الفرق بين الفرق، مكتبة دار التراث، القاهرة( د.ت)، ص٢٨٥. الشهرستانى، م. س، ج١، ص٢٩٤

٤ - عبداللة رازى، تاريخ كامل ايران، ارتاسيس ماد تا انقراض قاجارية، نوبت چاپ شانزدهم، چاپ اقبال، تهران ١٣٧٩ش، ص١٤٤

٥- البلاذري، انساب الاشراف، ج٤، ص٣٣٢، الطبرى، م. س، ج٤، ص٤٢٤، ابن كثير، م. س، ج١٠، ص٨١ ابن الطقطقى، م. س، ، ص١٧١- روم لاند، الاسلام والعرب، نقله عن الانگليزيه، منير بعلبكى، الطبعةالثانية، بيروت١٩٩٧، ص٧٦.

٦ – ئیسحاق تورك، یەکێك بوو لە پیاوەکانی ابو مسلم خورسانی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ابو مسلم نەمردووە بەڵکو لە چیاکانی ڕەی خۆی شاردۆتەوە لەکاتێکی دیاری کراو دەگەڕێتەوە. ابن النديم ، الفهرست، مطبعة الاستقامة، القاهرة (د.ت)، ص٤٩٧.

٧ - فاروق عمر فوزي، الخلافة العباسية، ص١٩ . خليل ابراهيم السامرائي، م. س، ص٣٥.

لەراستیدا هەموو ئەو بزووتنەوە جیاوازییە سیاسی و فیکرییانەی کەوا لەخوراسان سەریانهەڵدا بەهۆی کاریگەری سەرکردەکانیەوە بوو، هەر ئەویش بــەردەوامی بەشۆڕشـــەکان دەدا، بۆیـــە بەکوشـــتنی پێـــشەواکانیان بزووتنەوەکـە کۆتـایی دەهـات، هـەر بۆیـە کوشـتنی (ئیـسحاق) لەلایـەن خەلافەتەوە کۆتایی بـەم بزووتنـەوەش هێنـا[١] ، بـەڵام هـەر پـاش مـاوەی شــوێنکەوتووی ئــەو بزووتنــەوە لەناوچــوانە بــوون کــەدواتر دەبــوون بەشوێنکەوتووی کەسێکی تـر بـە شـێوازێکی تـر دەردەکـەوتن ، ئەوەتـە راوەندییــەکان[٢] کۆمەڵەیــەکی تــر بــوون کــە لەســاڵی (١٤١ك/٧٥٨ز) سـەریانهەڵدا و بەرهەڵستی و دژایـەتی( ابـو جعفـر المنـصور)یـان کـرد[٣]، ئەمانـە لەبنەچـەدا خوراسـانی بـوون[٤] لایـەنگر و هاوسـۆزی (ابـو مـسلم الخراسـاني) بـوون کـە بـەدەوری کۆشـکی (المنـصور) هـاتن وەك جۆرێـك

---

١- الجاحظ، م. س، ج٣، ص٢٣٩. عبداللة رازی، م. س، ص١٤٤، عبـدالعظیم رضـایی، تـاریخ ده هزار ساله ایران، جلد دوم، نوبت چاپ، هفتم، چـاپ اقـال، مـروی ١٣٧٥ش، ص٢٣٠.خالـد عزام، م. س، ص ٦٩.

٢ - راوەندییـەکان، کۆمـەڵێك خـەڵکی خوراسـان بـوون لـە شـاری هاشمیـە هەڵگەڕانـەوە نـاو دەبران بە راوەندییەکان، کـە باوەڕیـان بەگواسـتنەوەی روح هـەبوو. البلخـی، م. س، ج٢، ص٢٨١.

٣ - ابن الوردي، تاریخ ابن الوردی المسمی( تتمـة المختـصر فـی اخبـار البـشر)، تحقیـق، احمـد رفعت البـدراوی، دارالمعرفة، بیروت١٩٧٠م، ج١، ص٢٩٢. ابن العدیـم، م. س، ص٣٥، السیوطی، تـاریخ الخلفـاء، تحقیـق، محمـد محـی الـدین عبدالحمیـد، الطبعـة الثانیـة، مکتبةالـشرق الجدید، بغداد ١٩٨٣، ص٢٦١

٤ - الیافعي، مراة الجنان عبرة الیقظان فی معرفة مایعتبر من حوادث الزمان، وضع حواشیه، خلیل المنصور، دار الکتب العلمیة، بیروت ١٩٩٧، ج١، ص٢٢٩. ابن العماد، شذرات الذهب فی أخبار من ذهب، تحقیـق، عبـدالقادر الأرنـاوط و محمود الأرنـاوط، دار ابـن کـثیر، بـیروت ١٩٩٨، ج٢، ص١٩٢

لەســــتایش کـــردن بـــۆی[1] ، بـــەڵام کۆمــــەڵێك لەســــەرکردەکانیان دەستگیرکران[2] ئەوە بوە هۆی تووڕەبوونی راوەندییەکان و هەڵگەرانـەوە لە (المنصور) بەرهەڵستیان کرد[3] وەداوای تۆڵەی( ابـو مـسلم) یـان کـرد، دواجار (المنصور) توانی زاڵ بێت بەسەریانداو سەرکوتیان بکاتەوە[4].

لەراستیدا ئـەو بزووتنـەوە یاخیگەرانـەی کـە لەخوراسـان و هـەرێمی فارس سەریانهەڵدا لەڕووی سیاسی و فکرییەوە هاوشێوەی یـەکتری بـوون ئامانجیـان ئەنجامـدانی گۆڕانکـاری بـوو لەخەلافـەتی عەبباسـی کاریگـەری بیروباوەڕی کۆنی ئێرانیان لەسەر بـوو بەرهەڵـستی دەسـەڵاتی مەرکـەزیان دەکـرد. هــەر لەســـەردەمی خەلیفــە (ابــو جعفــر المنــصور) کەســایەتی (استاذســــیس) لەهـــــەرێمی خوراســـــان دەرکــــەوت[5] کەبانگەشـــەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و لایەنگری زۆری بۆخـۆی کـۆکردەوە،[6] و دەسـتی

---

١ - الطبري، م. س، ص٣٤، ابن الأثـير، الكامـل فـى التـاريخ، ج٥، ص٨٦، ابـن كـثير، م. س، ج، ١٠ ص٨٤. حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي، الطبعة الخامسة عشرة، دار الجبل، بيروت ٢٠٠١، ج٢، ص٨٩.

٢ - الطبري، م. ن، ج٤، ص٤٣٠. ابن كثير، م. ن، ج١٠، ص٨٤.

٣ - أبوحنيفــه الـدينوري، الاخبــار الطـوال، ص٣٨٤، عبــدالعظيم رفــاعى، م. س، جلـد دوم، ص٢٢٩.

٤ - ابن العبري، تاريخ مختصرالدول، المطبعةالكاثوليكية، بـيروت ١٩٥٨م ، ص١٢٢. القلقـشندي، مآثر الانافة فى معالم الخلافة، تحقيق، عبدالستار احمد فراح، عالم المكتب، بـيروت ١٩٦٤، ج١، ص١٧٩.

٥- ابن خياط، م. س، ص٧٩. گرديزى، تاريخ گرديزى، تصحيح و تعليـق، عبـدالحي حبيبـى، چاپخانه ارمغان، تهران ١٣٦٣ش، ١٩٨٤م، ص٢٧٦. الذهبى، العبر فى خبر من غـبر، تحقيـق، ابو هاجر محمد السعيد بن بسيونى زغلول، دار الكتب العلمية، بيروت(د.ت) ج١، ص ١٦٣.

٦ - ابن خلدون، تاريخ ابـن خلـدون المـسمى العـبر ديـوان المبتـدأ والخبر، دار الكتـاب اللبنـانى، بيروت ١٩٩٩م، ج٥، ص٤٢١. عبدالله رازى، م. س، ص١٤٤. خالد عزام، م. س، ص٧٠.

بەسەر زۆربەی ناوچەی خوراسان داگرت،[1] خەڵکێکی زۆر لەشاری مەرو[2] کوشت کەبەرهەڵستیان دەکرد و هەندێك لەهێزەکانی سەربەخەلافەت و چەند سەرکردەیەك شکستیان خوارد[3]، دواجار خەلیفە (المنصور) سوپایەکی زۆری بەسەرکردایەتی (خازم کوڕی خزیمە التمیمی) نارد بۆ بەرەنگار بونەوەی ئەو بزووتنەوەیە کەدوای شکست خواردنی (استاذسیس) و دواتر گەمارۆدانی کەناچاریان کرد بەخۆبەدەستەوەدانی و کەچارەنوسەکەی کوشتن بوو[4] بەم شێوەیە کوشتنی (استاذسیس) بوو بە هۆی نەمانی بزووتنەوەی (سیس) و لایەنگرانی.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە بزووتنەوەی شیعەگەری هەموو کات لەدەرفەتێك دەگەڕان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیان و زاڵ بوون بەسەر خەلافەتی عەبباسیدا.

دەرکەتنی (محمد کوڕی عبدالله) کەناسراوە بە(ذو النفس الزکیة) لەشاری(مەدینە)،[5] بەڵگەیە لەسەر ئەمە، کەلە ساڵی (١٤٥ك/٧٦٣ز)کە خەڵکێکی زۆر متمانەی خەلافەتیان پێدا[6] ئەمەش مەترسییەکی زۆری دروست کرد لەسەر دەسەڵاتی مەرکەزی بۆیە (المنصور) چوار هەزار

---

١- الذهبی، تاریخ دول الاسلام، ج١، ص٧٣. الذهبی، العبر فی خبر من غبر، ج٣، ص١١٦- عبدالعضیم رضایی، م. س، ص٢٣٠

٢- مەرو، شارێکی بە ناوبانگە لە شارەکانی خوراسان، الاسکندري، کتاب الامکنة والمیاه والجبال ونحوها، تحقیق، حسن محمد النابودة، دار الکتب العلمیة، بیروت ٢٠٠٠، ص٣٩٢.

٣ - الطبری، م. س، ج٤، ص٥٤٣. ابن الاثیر، الکامل، ج٥، ص١٦٢. فاروق عمر فوزی، الخلافة العباسیة، ص١١١.

٤ - السیوطي، م. س، ص٢٦٢. خالد عزام، م. س، ص٧٠. عبدالعزیز الدوري، العصر العباسي الأول، الطبعةالثالثة، دار الطلیعة للطباعة والنشر، بیروت ١٩٩٧، ص٧٢-٧٣.

٥ - ابن خیاط، م. س، ص٢٧٦.ابن العمراني، الإنباء في تاریخ الخلفاء، تحقیق، قاسم السامرائي، ، القاهرة ١٩٧٣، ص٦٤. ابن العبری، مختصر الدول، ص١٢٢

٦ - المسعودي، التنبیه والاشراف، بأشراف لجنة تحقیق التراث، دار مکتبةالهلال، بیروت ١٩٩٣، ص٣١١. الذهبی، دول الاسلام، ج١، ص٦٩. الیافعي، م. س، ج١، ص٢٣٢

جەنگاوەری بەسەرکردایەتی (عیسی کوڕی موسی) نارد بۆ ڕووبەوڕوو بوونەوەی ئەم بزووتنەوەیە کە سەرئەنجامەکەی سەرکوت کردنەوەیان و کوشتنی (محمد کوڕی عبدالله) ی لێکەوتەوە[1]، دەرکەوتنی (ابراهیم کوڕی عبدالله) برای (محمد) لەشاری بەسرا[2] بەشێکی تر بوو لەو بزووتنەوە شیعە گەرییانەی کەبەرهەڵستی خەلافەتی عەبباسی کرد، کەزۆربەی خەڵکی بەسرا متمانەی خەلافەیان پێدا[3]. بێ گومان ئەمەش مەترسی دروستکرد لەسەر دەسەڵاتی خەلافەت بۆیە(عیسی کوڕی موسی) بەفەرمانی خەلیفە (المنصور) بەرەو شاری بەسرا هات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (ابراهیم) دوابەدوای بەیەکگەیشتنیان لەشەڕێکدا (ابراهیم) کوژراو بزوتنەوەکە لەناوبرا[4].

لەراستیدا ململانێی دەسەڵات و خۆسەپاندن لەنێوان شیعەو دەسەڵاتی مەرکەزی رەگێکی مێژوویی قووڵی هەیە بەدوو ئاراستەی جیا لەیەکتری، کە تا ئەمڕۆش ئەم ململانێیە کۆتایی نەهاتووە و بەردەوامە. ئابەم شێوەیە دوابەدوای مردنی ( المنصور) لەساڵی (١٥٨ك/٧٧٤ز) کوڕەکەی (المهدی) وەکو جێنشینی باوکی بوو بەخەلیفەی دەوڵەتی عەبباسی،[5] لەڕاستیدا (المنصور) توانیبووی

---

١- المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ص٢٢٥ – التنوخي، نشوار المحاضرة واخبارالمذاكرة، تحقيق، عبود الشالجي، دار صادر، بيروت ١٩٧١م، ج٦، ص١٥٦-الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج١، ص١٥٣-ابن العمراني، م. س، ص٦٤

٢ - المسعودي، التنبيه و الاشراف، ص١٢٢. ابن الوردي، م. س، ج١، ص٢٩٤، اليافعي، م. س، ج ١، ص ٢٣٣.

٣ - اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص ٢٦٤.الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج١، ص٨٥٣، اليافعي، م. ن، ج١، ص٢٣٣.

٤- ابن خياط، م.س، ص٢٧٦، ابن الطقطقي، م.س، ص١٦٧.السيوطي، م. س، ص٢٦١، محمد الخضري بك، م.س، ص٦١.

٥- ابن قتيبةالدينوري، م. س، ج٢، ص٢٠٤. المسعودي، التنبيه والاشراف، ص٣١٢. ابن الكازروني، مختصر التاريخ، تحقيق، مصطفى جواد، مطبعة الحكومة، بغداد ١٩٧٠م، ص١١٨.

هــەموو بزووتنــەوە بەرهەڵــستی کارەکــانی خەلافــەت لــەناوببات و دەوڵــەتێکی تاڕادەیەك ئارام بۆ(المهدی) جێ هێڵێ، بەڵام ئەو بزووتنەوە سیاســی و فکریانــەی هــەرێمی فــارس هــەرجارە بەشــێوەیەك لەشــێوەکان خۆیــان دەردەخــست، خەلافــەتی(المهــدی) لەمــە بێبــەش نــەبوو دەرکــەوتنی (المقنــع)[1] لەســاڵی (١٦١ك/٧٧٧ز)[2] لەناوچــەی مــەرو[3] بەشــێك بــوو لــەو بزووتنــەوە بەرهەڵــستی کارانــەی دژ بەخەلافــەتی عەبباســی ، بۆیــە خەلیفــە (المهــدی) ســوپایەکی نــارد بەسەرکردایەتی

(سعید الحربی) بۆ بــەرەنگار بوونــەوە و لــەناوبردنی شۆڕشــەکەی (المقنــع) کەتێیدا خەڵکێکی زۆر کوژرا[4]، دوابــەدوای گــەمارۆدانی لەلایــەن ســوپای خەلیفــە بەکوشتنی (المقنع) لەساڵی (١٦٣ك/٧٧٩ز) کۆتایی بەم بزووتنەوەیە هات[5].

شــیکردنەوەی مێــژووی هێــزو هیــزری بەرهەڵــستی کارەکــان کــەدژ بەئاراستەی دەوڵــەتن دەبێتــە دەروازەی پەڕینــەوە بــۆ نــاو واقیعــی مێــژوویی، کەئــەوە روون دەکاتــەوە پەیوەنــدی دەوڵــەتی عەبباســی لەگــەڵ هێــزە هەڵگەڕاوەکان بریتی بووە لە ململانێ و جــەنگ ئەمــەش خــۆی لەخۆیــدا هێــزی دەوڵەت دادەمــاڵی، بــەم شــێوەیە بــەئاقاری مێــژوودا تێدەپــەڕین لەدەســەڵاتی

---

١ - المقنع، کەسایەتییەك بوو کە بانگەشەی خوایەتی دەکرد روێکی زێری لە خۆی گرتبوو ناو دەبرا بە مقنع شوێن کەو تووێکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کرد کە بیروباوەری وابوو خوا لەسەر وێنەی ئادەم دەرکەوتووە فریشتەکان کرنۆشیان بۆ بردووە دواتر لە وێنەی نوح و پێغەمبەرەکان دەرکەوتووە یەك لە دوای یەك ئینجا بۆ ( أبومسلم) خوراسانی دواتر بۆ( المقنع). الشهر ستانی، م. س، ج١، ص١٧٨- ابن کثیر، م. س، ج١٠، ص١٦٠

٢ - الطبري، م. س، ج٤، ص٦٠٩. ابن کثیر، م.ن، ج١٠، ص١٤٧. الدیابکري، تاریخ الخمیس فی احوال أنفس نفیس، دار صادر، بیروت(د.ت)، ج٣ ص٣٣٠

٣- ابن العبري، مختصر الدول، ص١٢٦. الذهبي، العبر فی خبر من غیر، ج١، ص١٨٠-ابن خلدون، العبر، ج٥، ص٤٣٩ محمد الخضري بك، م. س، ص٧٨.

٤ - الذهبي، م.ن، ج١، ص١٨٤. الدیار بکري، م. س، ج٣، ص٣٣٠- محمد الخضري بك، م.ن، ص٧٨. خلیل ابراهیم السامرائی، طارق فتحی سلطان، م. س، ص٤٢.

٥ – القلقشندي، ماثر الانافة فی معالم الخلافة، ص١٨٦، ابن الوردي، م. س، ص٣٠٢.

خەلیفەیەکــەوە بــۆ خەلیفەیــەکی تــر تــا هــاتنی( هــارون الرشــید)، لەســاڵی (١٧٠ك/٧٨٦ز) بوو بەخەلیفەی عەبباسی [1]، ئەوەی جێگەی سەرنجە لەسەر دەمی فەرمان ڕەوایـی ئـەودا لێـدانی بەرمەکییـەکان[2] ڕوویـدا لەسـاڵی(١٨٧ك/٨٠٢ز)[3] کە هەڵستا بەکوشتنی وەزیرەکـەی(جعفـر کـوڕی یحیـا)بەرمـەکی[4] و دەستگیر کردنی (الفضل کـوڕی یحیـا)ی بـرای تـا لەزینـدان مـرد[5]، کەئەمانـە ڕۆڵێکی کاریگەرییان هەبوو لەبەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنی کاروبـاری سیاسـی و ئیداری دەوڵەت و کارێکی تر کە (هارون الرشـید) کـردی دەسـت نیـشانکردن و هەڵبژاردنی کوڕەکانی (الأمین والمأمون و القاسم) یەك لەدوای یـەك وەکـو جـێ نـشینی خـۆی[6]. دواتـر کاردانـەوەو ڕەنگدانـەوەی خراپـی لەسـەر دەوڵـەتی عەبباسی هەبوو (هارون الرشید) لەساڵی (١٩٣ك/٨٠٨ز)کۆچی دوایی کرد[7].

(الأمـین) وەك یەکـەم جێنـشینی بـاوکی بـوو بەخەلیفـەی عەبباسـی[8]، لێرەوە شەڕی دەسەلاَت دەست پێدەکات کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بێهێز بوونی هێزی دەوڵەت هەبوو.

---

١ - ابن عبدربه، م. س، ج٥، ص١٠٦، المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ص٢١٨. محمد الخضری بـك، م. س، ص٨٩.

٢ - بەرمەکییەکان، خێزانێکی فارسی بیروبـاوەڕ مەجوسـی بـوون، ناوەکـەیان بـۆ باپیرەیـان بەرمـەك دەگەڕێتـەوە کـە سەرپەرشـتیکاری پەرسـتگای (بـەلخ) بـوو، دواتـر هەنـدێکیان بوون بە موسلمان لە سەرەتاکانی دەوڵەتی عەبباسی ئەم بنەماڵەیە پلەوپایەی وەزاریان پێدرا. حسن ابراهیم حسن، تاریخ الاسلام ،ج٢، ص٤٨.

٣ - الطـبري، م. س، ج٤، ص٧٠٤. ابـن الأثـير، الکامـل، ج٥، ص٣٤٨. البکجـري الحنفـی، تـاریخ الخلفاء، دراسه و تحقیق، اسیاکلیبان علی بارح، المکتبه العصریه، بیروت ٢٠٠٤، ص١١٨.

٤ - الدیاربکري، م. س، ج٢، ص٣٣٢. ابن الوردی، م. س، ص٣١١. الیافعی، م.س، ج١، ص٣١٣.

٥ - ابن العبري، مختصر الدول، ص١٢٩، الذهبي، العبر في خـير مـن غـير، ج١، ص٢٤٠- ابـن کـثیر، م.س، ج١٠، ص ٢٣٢.

٦ - ابن العبري، مختصرالدول، ص١٢٩. السیوطي: تاریـخ الخلفـاء، ص٢٩٠، فـاروق عمـر فـوزي، الخلافة العباسیة، ص٢١٦.

٧- الطبري، م. س، ج٢، ص١٥. ابن الکارزوني، م. س، ص١٢٧. ابن کثیر، م. س، ج١٠، ص٢٣٣.

٨ - الیعقـوبـي، تـاریخ الیعقـوبـي، ج٢، ص٣٠٤. المـسعودي، مـروج الـذهب، ج٣، ص٣١٣. الدیاربکری، م. س، ص٢٣٩.

سـەرەتاو دەسـپێکی کێـشەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (١٩٤ك/٨٠٩ز) کاتێك (الأمين) بانگەشەی بۆ کوڕەکەی (موسا) کـرد وەکـو جێنـشینی خـۆی ئەمەش لادانی (المأمون) دەگەیەنێ[١].کە ئەو کات لە خوراسان بوو[٢]

ئەو کارە بووە هۆی هەڵچوونی تووڕەبوونی (المـأمون) سـەرنجامەکەی بـەرپابوونی جـەنگی لێکەوتـەوە[٣]. تەنانـەت لـە شـەڕی نێـوان دوو بـرا بـوو بەشـەڕی نێـوان دوو دەسـەڵات و دوو عەقلیـەت و دوو نەتـەوە[٤]، تادواجـار بەگەمارۆدانی بەغدا لەلایـەن (طـاهر کـوڕی الحـسین) سـەرکردەی هێزەکـانی (المأمون)[٥] وە کوشتنی (الأمين) لەساڵی (١٩٨ك/٨١٣ز) کۆتایی بەم شـەڕە هـات[٦]. کـە زیـاتر لەچـوار سـاڵی خایەنـد بێگومـان بـەرپابوونی جـەنگ لـەو ماوەیەدا پێویستی زۆری بەلایەنی ماددی و مرۆیی دەبێت ئەمەش کاریگـەری خراپی لەسەر خودی دەوڵەت دەبێ.

---

١ - اليعقوبي، م.ن، ج٢، ص٣٠٦. ابن الوردي، م. س، ص٣١٦. الاربلي، خلاصة الذهب المسبوك مختصرمن سير الملوك، تحقيق، مکی السيد جاسم، مکتب المثنی، بغداد(د.ت)، ص١٧٢.

٢- المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ص٣٦٥ — ابن الطقطقي، م.س، ص٢١٢.

٣ - ابـن اعـثم الکوفي، م. س، ج٨، ص ٢٩٨ -٢٩٩. الـذهبي، دول الاسـلام، ج١، ص٨٨. عبـدالجبار نـاجی، الدولـة العربيـةفی العـصرالعباسی، مطـابع التعلـيم العـالی جامعـة البـصرة ١٩٨٩، ص١١١.

٤- دوو نەتەوە: مەبەستمان عـەرەب و فارسـە بـە وپێیـەی کـە دایکـی (المامون) فـارس بـوو، وەزیرەکەی (الفضل کوری سهل) و لایەنگرانی هاو رەگەزی دایکی بوون بە پێچەوانەوە (الامين) دایکی عەرەب بوو، وەزیرەکەی (الفضل کوری الربيع) و لاينگرانی عەرب بـوو. حسن ابراهيم حسن، م. س، ج٢، ص١٤٧، عبدالجبار ناجی، الدولة العربية، ص١٠٩.

٥ - القلقشندي، مأثر الانافة فی العالم الخلافة، ج١، ص٢٠٦. الاربلی، م.س، ص١٧٢

٦ - ابن خياط، م. س، ص٣١٠.ابن عبدربه، م. س، ج٥، ص١٠٧، المسعودی، التنبيـه والاشـراف، ص٢١٨الخطيب البغدادی، تاريخ بغداد أو مدينة السلام، تحقيق، مصطفی عبدالقهار عطا، الطبعةالثانية، دار الکتب العلمية، بيروت ٢٠٠١، ج٤، ص١٠٨.

(المـأمون) لـه سـالّی(١٩٨ك/٨١٣ز) خەلافـەتی دەوڵـەتی عەبباسـی وەرگرت[١] دیارە سەردەمی فەرمانڕەوای ئەویش بێکێشە نەبووە، بەتایبـەتی هەرێمەکانی دەوڵەت لە ناسەقام گیری سیاسـیدا بـوون پـاش شـەڕی نـاوخۆ عەلەوییـەکان ئـەو بارودۆخـەیان بەدەرفـەت وەرگـرت، لەکوفـە شۆڕشـیان هەلگیرساند [٢]، ویّرای ئەوەی ئەم شۆڕشە مەودای فراوان بوو، جگە لـەعیراق و حیجاز یەمەنیشی گرتەوە[٣]، بەڵام کورت خایـەن بـوو واتـا بێئـەنجام بـوو نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی بپێکی.

هـەر لـەم ئانوسـاتەدا بزووتنـەوەی بابـەکی خـورەمی[٤] لەهـەرێمی ئازربیجان[٥] دەرکەوت[٦] کەبەهۆی سەرقاڵ بوونی خەلافەت بـەو شۆڕشـانەی لـە هەرێمـەکانی عـەرەبی سـەریان هەڵـدابوو بابـەکی خـورەمی تـوانی بیروباوەڕەکـانی خـۆی لـە ناوچـەکانی ئازربیجـان، ئـەرمینیا، ئەسـفهان، هەمـەدان، دەینـوەر، ئـەهواز و چـەند ناوچـەیەکی تـر بڵاوبکاتـەوە[٧]، تـوانی پەیوەنـدە لەگـەڵ دەوڵـەتی بێزەنتینـی پەیـدا بکـات و یارمـەتییان لـێ

---

١ - ابـن عبدربـه، م. س، ج٥، ص١٠٨، ابـن كـثير، م. س، ج١٠، ص٢٦٧، ابـن الكـارزوني، م. س، ص١٣٤.

٢ - الطـبري، م. س، ج٥، ص١٤٢. ابـن الأثـير، الكامـل، ج٥، ص٤٦٤. البكجـري الحنفـي، م.س، ص١٢٠.

٣ - المسعودى، مروج الذهب، ج٤، ص٢٤، ابن كثير، م. س ، ج١٠، ص٢٦٨-٢٦٩.

٤- خورەمی، ئەوانـە شوێن کـەوتووی بابـەکی خـورەمی بـوون کـە هاوشـێوەی بـیرو بـاوەری مـەزدەکی بوو پێش ئیسلام پێان وابوو خەڵك هاوبەشە لە ماڵ و لە ئافرەت. البغـدادى، م. س، ص٢٨٥-٢٨٦. الشهرستانى، م. س، ج١، ص١٧٦.

٥- ئازربیجان، هەرێمێکی فراوانە لە نێوان قهستان و ئاران کەتێـدا زۆر شـارو لادێ و چیـا و روبـار لـە خـۆی دەگرێت.(ئێـستا ئازربیجـانی ئێرانـی دەگرێتـە وە) القزوينـى، م. س، ص٢٨٤

٦ - المسعودى، التنبيه و الاشراف، ص٣٢٢، الذهبى، دول الاسلام، ج١، ص٩٢. فاروق عمر فوزى، العباسيون الأوائل، دار مجدلاوي، عمان — الأردن ٢٠٠٢م، ص٣٤٩.

٧- ابن النديم، م. س، ص٤٩٣ - گرديزى، م. س، ص١٧٥ - ابن العبرى، مختصر الدول، ص١٣٩.

وەربگرێت[1] کە دوژمنێکی هەمیشەیی خەلافەت بوو لەگەڵ ئەوەی (المأمون) هەوڵی زۆریدا بۆ دامرکاندنەوەی لەناوبردنی ئەوبزووتنەوەیە، وە چەند سەرکردەیەکی دانا بۆ رووبەڕوو بوونەوەیان[2] بەڵام تا نەمانی دەسەڵاتی و کۆتایی ژیانی نەیتوانی لەم هەوڵەدا سەربکەوێ.

کاتێک (المعتصم کوڕی هارون الرشید) لەساڵی (٢١٨ك/٨٣٣ز) دوای(المأمون)ی برای دەبێت بەخەلیفە[3]، هەموو هەوڵەکانی خۆی چڕدەکاتەوە بۆ لەناو بردنی بزووتنەوەی خوڕەمی بۆ ئەم مەبەستە(الافشین)ی راسپارد بۆ بەربەرەکانی کردنی بابەك[4]، پاش چەندین شەڕو هەوڵ و بەرەنگار بوونەوە، ئینجا توانی لە ساڵی( ٢٢٣ك/٨٣٦ز) ناوبراو دەستگیر بکات و کۆتایش بەبزووتنەوەکە بهێنێت[5]، بێگومان لەناو بردنی بزووتنەوەیەکی ئاوا پێویستی بەلایەنی ماددی زۆرە،

وەکو( الذهبي) دەڵێ ((لەم ساڵەدا (المعتصم) پارەی بیت و المالی بەهەزاران هەزار دیناری سەرف کرد لە شەرەکە))[6]، بۆیە سەرفکردن و کەم بوونەوەی سەروەت و سامانی دەوڵەت، واتە نەمان و فەوتانی هێزی دەوڵەت، جگەلەوەی کاریگەری زۆری لەسەر بژێوی کۆمەڵگا دەبێت، سەرئەنجامەکەی لێک ترازان لەنێوان خەڵك و دەسەڵات دروست دەکا، وێڕای ئەوەی لە

---

١ - بندلی جوزی، من تاریخ الحرکات الفکریة فی الاسلام، دار الروائع، بیروت (د.ت)، ص٨٠-٨١. خلیل ابراهیم السامرائي و طارق فتحی سلطان، م. س، ص٤٢.

٢ - الطبري، م. س، ج٥، ص٢٠٠، - الیافعي، م. س، ج٢، ص٤٢. محمد الخضري بك، م. س، ص١٦٦.

٣ - الازدي، م. س، ص٤١٥- الخطیب البغدادي، تاریخ بغداد، ج٤، ص١١٢— ابن الکازوروني، م. س، ص١٣٨.

٤ - ابن اعثم الکوفي، م. س، ج٨، ص٢٤٤. الذهبي، العبر في اخبار من غبر، ج١، ص٢٩٨. مؤلف مجهول، العیون والحدائق في اخبار الحقائق، ص٣٨٣.

٥ - ابن خیاط، م. س، ص٣١٦. المسعودي، التنبیه و الاشراف، ص٣٢١- عبدالله رازی، م. س، ص١٤٥.

٦ - دول الاسلام، ج١، ص٩٧.

ناوبردنی ئەو بزووتنــەوە هەڵگەڕاوانــە کــارێکی پێویــست بــوو، بــۆ پارێزگــاری کردن لە سنووری خەلافەت.

هەر لەسەردەمی ئەو خەلیفەیە (مازیار) لـە طبرسـتان[١] یـاخی بـوو[٢] هــەوڵی جیابوونــەوەی لەجەســتەی دەوڵــەتی عەبباســیدا، بــەڵام هەوڵــەکانی ســەرکەوتوونەبوو (المعتــصم) تــوانی لەســاڵی (٢٢٥ك/٨٣٩ز) بــەهاوکاری (عبدالله کوڕی طـاهر) بەسـەر (مازیـار) سـەرکەوێت دەسـتگیری بکـات[٣]، وە دواتر کوشتیان[٤].

دیارە لەناوبردنی ئەو بزووتنەوە یاخی بووانە دەسکەوتێکە بۆ خـۆی و لادان و نەهێـشتنی مەترسـییەکی گـەورەش بـوو لەســەر خەلافــەت، بــەڵام دیاردەی زۆربوون و زیاد بـوونی ڕێـژەی تـورك لـە دام و دەزگاکـانی دەوڵـەت وەکو ( المسعودي) ئاماژەی پێدەکات دەڵێ ((المعتصم خوش حال بوو لە کۆکردنــەوەی تــورك و کرینــی لەدەســتی خاوەنــەکانیان کــە نزیکــەی چــوار هەزاری کەسی بۆ خۆی گلدایـەوە))[٥]، دەکرێـت ئـەوەش بـەهۆی کاریگـەری دایکیەوە بێت کـە تـورك بـوو[٦]، دواجـار ڕەنگدانـەوەو دەرئـەنجامی خراپـی لێکەوتــەوە تــا ئــەو ڕادەیــەی کــە (احمـد امـین) دەڵـێ ((مێـژوو چـووە نـاو ململانێیەکی دەمارگیری ڕەگەزێکی نـوێ کەلـەوەو پـێش ململانێکـە لـەنێوان عەرەب و فارس بـوو لێـرەوە دەبێـت بـە کێـشەی نێـوان عـەرەب و فـارس و

---

١ - طبرستان، هەرێمێکە لە نێوان عیراقی عەجەمی و خوراسان نزیـك رووبـاری خـەزەر کـە شارو گوندێکی زۆر لە خۆ دەگرێ. القزوینی، م. س، ص٢١٧.

٢ - الطـبري، م. س، ج٥، ص٢٧٧، ابـن كـثير، م. س، ج١٠ص، ٣١٦. ابـن الفقيـه، مختـصر كتـاب البلدان، طبع بمطابع بريل، ليـدن ١٨٨٥م.اعـادت طبعـه بالاوفـسيت مكتبـة المثنـى بغـداد، ص٥٢.

٣ - الذهبي، دول الاسلام، ج١، ص٩٨- اليافعي، م. س، ج٢، ص٦٢.

٤ - الدينوري، الأخبار الأطوال، ص٤٠٢. البغدادي، الفرق بين الفرق، ص٢٠١.

٥ - مروج الذهب، ج٢، ص٤٨.

٦ - ابن حزم الأندلسي، جمهرة أنساب العـرب، تحقيـق، لجنـة مـن العلمـاء، دار الكتـب العلميـة، بيروت ١٩٩٨م، ص٢٤، عبدالعزيز الدورى، العصرالعباسى الاول، ص١٧٧

تــورك))[1]. کەهەریــەك لەوانــە دەیــان ویــست پێگــەی خۆیــان لەدەســەلآت بسەپێنن، بەلآم بەهۆی زیادبوونی رێژەی تورك مێـژووی دەولـەتی عەبباسـی رووپۆشێکی تورکی بەخۆیەوە بینی بەهۆی بالآدەست بوونیان لـە پێگـەکانی دەولەت بەتایبەتی لەبواری سـوپادا. دوابـەدوای مردنـی (المعتـصم) لەسـالی (٢٢٧ك/٨٤١ ز)دا (الواثـق)ی کـوری بـوو بەخەلیفـە[2]،کەلەســەر هــەمان سیاسەتی باوکی دەرۆیی لەپالپشتی کردن و پلـەدارکردنی تـورك وەکـو(ابـن الاثیر) دەلێ ((الواثق) تاجی بە(اشناس) بەخشیی))[3]، دیارە ئـەوەش خـۆی لەخۆیدا پایەدارکردن و هێنانیانە بۆ ناو کایە سیاسییەکان و سەربازییەکان ، هــەروەها چــەند کەســایەتیەکی تــر وەك(بغـا) کەســەرکردەی ســوپابوو[4] و (ایتاخ) تورکی و (وصیف) ترکی کە پلەو پایەی تایبەتییان هەبوو[5]. ئەمانـە دواتر رۆلی کارایان گێـرا لـە قـۆرخکردن و پـاوانکردنی دەسـەلآتی سیاسی و ســەربازی و هەلبــژاردن و لادان و تیرۆرکردنــی خەلیفــەکانی عەبباســی و نەهێشتنی سەنگ و قورسایی مەرکەزی خەلافەت.

هەروەها پاش مردنـی (الواثـق) لـە سـالی(٢٣٢ك/٨٤٦ ز)دا (المتوکـل) بوو بەخەلیفە[6]. لێـرەوە رەوشـی دەولـەت بەتـەواوی بـەرەو لاوازی هــەنگاو دەنێ، کەدواتر باس لەشێواز و رێگاکانی لاوازی دەولەتی عەبباسـی دەکـەین کەفاکتەرێکی بەهێزبوو بۆ دەرکەوتن و سەر هەلدانی میرنـشینە کوردییـەکان لەهەرێمە کوردنشینەکان.

---

١ - ظهر الاسلام، الطبعة الخامسة، دار الكتاب لعرب، بيروت ١٩٦٩م، ج١، ص٥.

٢ - المسعودي، التنبيه و الأشراف، ص٣٢٩، ابن الطقطقي، م. س، ص٢٣٥.

٣ - الكامل، ج٦، ص٨٥.

٤ - الطبري، م. س، ج٥، ص٣٠٨. ابن الأثير، م.ن ، ج٦، ص٩٠.

٥ - ابن الكازروني، م. س، ص١٤٤. نادية حسني صقر، السلم في العلاقات العباسية البيزنطية فى العصر العباسى الأول، دار الندوة الجديدة، بيروت ١٩٨٥، ص٤٢.

٦ - ابن عبدربه، م. س، ج٥، ص١١١.

لەگەڵ هەموو ئەو بزووتنــەوە سیاسـی و جیـاخوازی و یاخیگەریانـەی کەسەریان هەڵدا و ئەو کێشە و ململانێیـە نـاو خۆییانـەی لەسـەر دەسـەڵات بـەرپابوون. وێـرای شـۆڕش و بزافـە شـیعە گەریـەکان کـە لەچوارچـێوەی دەوڵەتی عەبباسیدا هەبوون، کەباسمان لێوەکردن، بزووتنەوەیەکی تری وەك (خەواریج [1] – شوراتەکان)، بەردەوام هەرەشەو مەترسـی بـوو، کـەم تـا زۆر کێشەیان لەناوچە جیاجیاکانی سەر بە دەوڵەت دروست دەکرد.

نابـێ ئـەوەش فـەرامۆش بکـەین کـە بەدرێـژایی خەلافـەتی ئیـسلامی دەوڵەتێکی زلهێزی ئەو کات وەکـو بیزنتییـەکان لـە ئـارادا بـوو کـە کێـشەو کێبەرکێ و جەنگی لەگەڵ دەوڵەتی

عەبباسی هەبوو، وەك دوژمنێکی راسـتەوخۆو هەمیـشەیی هـەر کاتێـك هـەل و دەرفـەتێکی بـۆ بـڕە خـسابووایە سـنوورەکانی دەوڵـەتی دەبەزانـد و ئـاژاوەو تەنگـژەیان بـۆ سـەر دەسـەڵاتی مەرکـەزی دروسـت دەکـرد بـەهۆی داگیرکردنی شـارو لادێ سـنوورییەکانی سـەر بەخەلافـەت کـە ئەمـەش خـۆی لەخۆیدا خۆئامادەکردن و خۆتەیارکردنی دەوێ لەڕووی مـاددی و مرۆییـەوە بــۆ بەرەنگاربوونــەوە و بەرهەڵــستی کردنــی ئــەو هێرشــە دەرەکیانــەی کەئاراستەیان دەکران و کاریگەری ناڕاستەوخۆی لەسەر پێکهاتـەی دەوڵـەتی عەبباسی هەبوو.

---

١ - خەواریج، بریتین لە کۆمەڵێکی دینی سیاسی کە بنەمای (تحکیم) یان پـێ قبـوڵ نـەبوو لەنێوان ئیمامی عەلی و معاویـەی کوری ئـەبو سـوفیان لـە جـەنگی(صـفین) وە بـەهۆی دەرچوونیان، پێیان وتـراوە خـەواریج. بڕوانـە : القلقـشندي، صـبح الاعـشی فـی صـناعة الانشا، تحقیق، محمدحسین شمس الدین، دار الکتب العلمیة، بیروت ١٩٨٧، ج١٣، ص٢٢٥.

**تەوەرەی دووەم**

## بارودۆخی سیاسی هەرێمە کوردنشینەکان بەر لە سەرهەڵدانی میرنشینەکان

بارودۆخی ناوچە کوردییەکان بەشێوەیەکی گشتی جۆرێك لە ناسەقام گیری سیاسی بەخۆیەوە بینی بوو، بەر لە سەرهەڵدانی میرنشینە کوردییەکان بەهۆی ئەو شەڕو ململانێیە کە لە نێوان ئەو هێزو دەسەڵاتە ناوچەییانەی کە هەریەك بۆ زاڵبوون و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی هەوڵدەدا.

لە راستیدا گۆڕانکاری دەسەڵاتی سیاسی و گرتنە دەستی دەسەڵات و خۆسەپاندن بەسەر ناوچە و هەرێمەکان، دوای لاوازی دەسەڵاتی مەرکەزی بەندبووە، بەهێزی سەربازی، چەند لە بواری سوپایی بەهێزبووایە، ئەوەندە سنووری هەرێمایەتی فراوانتر دەبوو، شوێن پێگەی جوگراف دەسەڵاتیان بەرەو زیادبوون دەچوو، بۆیە ئەم بارو دۆخە بواری بۆ گەلێك هێز خۆشکرد بۆ ئەوەی لە هەوڵ دابن بۆ خۆ سەپاندن، دیارە ناوچەکانی کوردستان و ئەو هەرێمانەی کە دواتر میرنشینی کوردییان لەسەر بنیات نرا لەم بارودۆخ و هەلومەرجە بەدەر نەبوو وەکو بەشێك لە چوار چێوەی سنووری خەلافەتی عەبباسی، لێرەدا ئاماژە بە بەشێك لەو بارودۆخە دەکەین.

### - هەرێمی ئازربیجان و ئاران

ناوچەکانی ئازربیجان و ئاران لە سەرەتای ( ٤ ك / ١٠ن) لە ژێر فەرمانڕەوایی والی خلافەتی عەبباسی (یوسف کوڕی ابی الساج)دا بوو[1]، لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندی جێگیری نەبوو، لەگەڵ ناوەندی دەسەڵات لە

---

١ - مسعود بن نامدار، (الف کتابه فی حدود سنة ٥٠٠هـ/١١٠٦م) فصول من تاريخ الباب وشروان، اعتنى بنشرها، مينورسکی، کامبردج ١٩٥٨، ص١٧- ابن الاثير، الکامل،ج٦، ص٦٤٦

ساڵی (٣٠٧ک/ ٩١٩ز) یوسف لە مەڵبەندی خەلافەتەوە زیندانی دەکرێ[1].بەڵام ئەم زیندانی کردنە درێژخایەن نابێت لەلایەن خەلیفە (المقتدر) ئازاد دەکرێت و دەکرێتەوە بەفەرمانڕەوای ئازربیجان و ئاران[2].(یوسف کوڕی ابی الساج) لە دەسەلآت بەردەوام دەبێت تا لە ساڵی( ٣١٤ك/٩٢٦ز) لەلایەن خەلیفە (المقتدر) بانگێشت دەکرێت بۆ بەرەنگار بوونەوەو ڕووبەڕوو بوونەوەی بزووتنەوەی (القرامطة)[3]لەشاری واسط[4]، سەرەنجام لە ساڵی (٣١٥ك/٩٢٧ ز)دا (یوسف کوڕی ابی الساج) دەکوژرێت[5]. دیارە نەمانی ناوبراو دەبێتە ڕێگە خۆشکەرێك بۆ (دیسم کوڕی ابراهیم الکردی)[6]، تاوەکو

---

١ - مسكويه، تجارب الامم، تحقيق، سيد كسروى حسن، دارالكتب العلمية، بيروت ٢٠٠٣، ج٥،ص ٢٨-٢٩ - ابن الاثير، الكامل،ج٦، ص٦٤٦.

٢ - المسعودي، مروج الذهب ،ج٤، ص٢٧٥.ابن الاثير، الكامل،ج٦، ص٦٧٩-٦٨٠ . احمد كسروى ،شهرياران گمنام موئسسة انتشارات نگاه، تهران ١٣٨٥، ص٧٠.

٣ - القرامطة، گروپێکی ئاینی شیعە بوون سەرەتای دەرکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(٢٧٨ک/ ٨٩١ز) لە کوفە بەسەرکردایەتی (حمدان کوری قرمط). البغدادي، الفرق بين الفرق، ص٣٠٦. بۆزانیاری زیاتر بروانە، محمود اسماعيل، الحركات السرية في ألاسلام، الطبعة الخامسة، دار سينا للنشر، القاهرة. مؤسسة الانتشار العربي، بيروت ١٩٩٧م، ص١١٧-١٥٧.

٤ - ابن الاثير، الكامل،ج٦، ص٧٠٤- احمد كسروى، م ..س، ص٧٠

٥ - المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٧٥.مسكويه، م.س ،ج٥، ص٩٨-١٠٣.

٦ - ابراهیم الکردی، باوکی دەیسمە بە نەژاد کوردە. یەکێك بووە لە سوار چاکەکانی (هارون کوری عبدالله شاری) سەر کردەی بزافی شوراتەکان لە موصل و جەزیرە دوای شکستی شوراتەکان لە ساڵی (٢٨١ک/ ٨٩٤ز) دا لەسەر دەستی سوپای عە بباسی، (ابراهیم) لە گەڵ کۆمەڵێ لە شوراتەکان هەلآت و رووی کردە هەرێمی ئازەربایجان لە وێ کچی سەردارێکی کوردی خواست دەیسەم لەو ژنەبوو، دەیسەم کە گەورە بوو پەیوەندی کرد بە سوپای والی ئازربیجان( ابن ابی الساج) و بە پلەکانی سوپایدا سەر کەوت تا بوو بە جێگری والی. ابن خلدون، العبر، ج٦، ص٨٦٢ . زرار صدیق توفیق، قۆناغەکانی سەرهەڵدان وگە شەکردنی میرنشینە کوردییەکان لەسەردەمی عەباسیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژمارە (١) هەولێر ٢٠٠٢، ل٩٩-١٠٠.

دەست بگرێت بەسەر ئازربێجان و ئاران سەربەخۆیی خۆی رادەگەیەنێ دەبێت بە فەرمانرەوای ئەو ناوچانە [1].

بەڵام ئاماژەی مێژوویمان نییە سەبارەت بەشێوازی فەرمانڕەوایی (دیسم) و بارودۆخی ئەو هەرێمانە لەو ماوەیەدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گۆڕنکاریی و رووداوێکی بەرچاو رووی نەداوە تاسالی(٣٢٦ک/٩٣٧ن) وەك (مسكويه) و (ابن الاثير) ئاماژەی پێدەکەن، لەم ساڵەدا (لشكرى) کە جێگر و هاوکاری( وشمگیری کوڕی زیار) بوو لە هەرێمی چیا هێرش دەکاتە سەر ئازربیجان هاوکات (دیسم کوڕی ابراهیم) سوپاکەی کۆدەکاتەوە کە زۆربەی لە کورد پێکهاتبوو بەرەنگاری (لشکری) دەبێتەوە لە ماوەی دوومانگدا سوپاکانیان دووجار بەریك کەوتن سەرنجام (دیسم) شکست دەخوا[2]، (لشکری) دەست دەگرێت بە سەر هەموو ئازربیجان تەنها شاری ئەردەبیل[3] نەبێت، دانیشتووانەکەی گوێبیستی خراپی هەڵسوکەوتی دەیلەمەکان بووبوون لەگەڵ ولاتی چیاو خەڵکی هەمەدان، بۆیە بەرگرییەکی توندیان کرد، بەڵام پاش گەمارۆ دانێکی درێژخایەن و شەڕ و پێکدادانێکی زۆر (لشکری) توانی بچێتە ناو ئەو شارە[4]، بەلام دانیشتووانی ئەردەبیل بەهاوکاری (دیسم) توانیان گەورەترین شکست بە ناوبراو بێنن و ناچاری بکەن بەپاشەکشە کردن، بۆیە پەنای بردەبەر (ابن دولە) فەرمانڕەوای موقان[5]، ئەویش یارمەتیدا بۆ هێرشیکردەنە سەر ئازربیجان جارێکی تر(دیسم) شکستی خوارد و هەلات[6].

---

١ - حسين حزنی موکریانی، کوردستانی موکریان یا اتروپاتین، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی زاریکرمانجی، رەواندز ١٩٣٨، ل١٦٨.

٢ - تجارب الأمم، ج ٥، ص٢٢١. الكامل، ج٧، ص٧٤.

٣- ئەردەبیل، بەناوبانگترین شارەکانی ئازربیجانە کە بە رووبارو سەرچاوەی ئاوەی زۆرو داهات و بەروبومی هەمەچەشن دەوڵەمەندە. ياقوت الحموی، م. س، ج١، ص١٤٥.

٤ - مسكويه. م.س، ج٥، ص٢٢١. ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٧٤

٥ - موقان، هەرێمکی بچوکە لە باکوری رۆژهەلاتی ئازربیجان کە زوربەی دانیشتوانەکەی تورکمان بوون. ياقوت الحموی، س. پ، ج٥، ص.٢٢٥

٦- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٧٤-٧٥. احمد كسروی، م.س، ص٧٢-٧٣.

ئازربیجـان لـەو نێوەنـدەدا بـوو بـە پێگـەو شـەڕوململانێ، جێـی چـاو تێبرینی دەورو بەر هەریەکەیان هەوڵی دەدا بـۆ پەیـداکردنی هێـز و بەسـتنی پەیوەنـدی لەگـەڵ هێزێـك بـۆ پـاوانکردنی دەسـەلاّت و ئـەنجام دانـی فـراوان خوازی.

(دیسم) بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگی و پەیداکردنی هێز داوای یارمەتی لە (وشمگیر کوڕی زیـار) کـرد لەراسـتیدا یارمـەتی وەرگـرتن لـە نـاوبراو لەسـەر بنەمای چەند مەرجێك بوو وەك دابین کردنی خـەرجی سـوپا و خوێندنـەوەی وتاری هـەینی بـەناوی ئـەو و دابینکردنـی سـەد هـەزار دینـار سـالأنە ،دیـارە (وشمگیر) لە فراوان خوازەییەکانی (لشکری) کەوتبووە ترسەوە[1].

(دیسم) دەستی کرد بـە ئامـادەکردنی سـوپا بـە ئاراسـتەی ئازربیجـان هەنگاوی نا ئەم هاوپەیمانییەی (دیسم)لەگـەڵ (وشمگـیر) ترسـێکی زۆری لـە سەر (لشکری) دروست کردبوو، بۆیە بەرەو ئەرمینیا چوو لە ئاکامدا لە لایەن ئەرمەنەکان کوژرا[2]. کوڕەکەی (لـشکرستان) لەگـەڵ بەشـێك لـە سـوپاکەی بـاوکی بـەرەو شـاری موصـل چـوو پـەنای بـردە بـەر (ناصـر الدولـە کـوری حمدان)ی حەمدانی بۆ یارمەتی دانیـان، لەگـەڵ ئـەوەی نـاوبراو بـە یارمـەتی حەمدانییەکان هێرشیان بردە سەر ئازربیجان، بەلاّم سەرکەوتوو نـەبوون لـە لایــەن (دیــسم) ەوە بەرهەڵــستیان کــراو ناچــاریان کــردن بــەرەو موصــل بگەڕێنەوە[3]، (دیسم) ئەو پەیمانەی بەسـتبووی ئـەو مەرجانـەی بەسـەری دا سەپێنرابوو نەی گەیاندە سەر، بەهۆی لاوازی (وشمگـیر) و گیرۆدەبـوونی بـە هێرشکاری بوەیهییەکان[4].

---

١ - مسکویە، م.س، ج٥، ص٢٢٢ ، احمد کسروی ، م.ن ، ص٧٣.

٢ - مسکویە، م. ن، ج ٥، ص٢٢٢ –٢٢٣. ابن الاثیر، الکامل، ج ٧، ص٧٥.

٣ - ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص٧٥- ٧٦، احمد کسروی، م.س، ص٧٥.

٤ - صدیق زادە بورەکەی، دائرە المعارف کردی (فرهگ اعـلام)جلـد دووەم، تهـران١٣٨٠، ل٤٤٧- حسین حزنی ، کوردستان موکریان ،ل١٧٩.

له ساڵی (٣٢٨ك/٩٣٩ن) (ابو نصر مرزبان كوڕی محمد كوڕی مسافر) هێرش دەكاتە سەر ئەردەبیل بۆ ماوەی سێ ساڵ گەمارۆی دەدات[١]، بەلاَم (مسكویە) ئەو رووداوە دەگەڕێنیتەوە بۆ ساڵی (٣٣٠ك/٩٤١م) كاتێ (ابو القاسم علی كوڕی جعفر) كە وەزیری(دیسم) بوو پەنا دەباتە بەر (مرزبان) لە ناوچەی( تارم) ئەمە دەبێتە پاڵنەرێكی سەرەكی بۆ داگیر كردنی ئازربیجان بەتایبەتی (ابو القاسم) لەگەڵ (مرزبان) لەرووی فكرییەوە یەكانگیر و هاوسۆز و هاو هەڵوێست بوون لەگەڵ رێبازی شیعەی باتینی بە پێچەوانەی (دیسم) كە لە رووی بیرو باوەرەوە هاوسۆز بوو لەگەڵ خەوارجەكان[٢]. دیارە ئەمە كاریگەری خۆی هەیە جگە لەوەی (ابو القاسم) هەڵسا بە راكێشانی سەرنجی (مرزبان) بۆ خێرو بێری ئەو داهات و بەرهەمەی كە لەم هەرێمەدا هەیە، ئەوە فاكتەرێكی كاریگەر بوو بۆ داگیر كردن و دەست بەسەر داگرتنی ئازربیجان و ئاران. دوای گەمارۆ دانێكی توندی( دیسم) لەشاری تەبرێز توانیان دەست بەسەر ئەم شارەدا دابگرن[٣].دوا بەدوای ئەمە (مرزبان) هەنگاوی نا بەرەو دەست بەسەر داگرتنی ئەردەبیل بۆ ئەو مەبە ستە هەوڵی دا لە رێگەی وەزیرە تازەكەی(دیسم)ەوە بەناوی (ابو عبدالله محمد كوڕی احمد النعیمی) ئەم كارە بكات لەوەش دا سەركەوت، هەڵسا بە گەمارۆ دانێكی درێژخایەنی (دیسم) لە ئەردەبیل ناچاری كرد شارەكە بەدەستەوە بدات[٤]. سەرەنجام (مرزبان) توانی دەست بگرێت بەسەر ئازربیجان و ئاران[٥].

---

١ - مولف المجهول، العیون و الحدائق فی اخبار والحقائق، تحقیق، نبیلەعبدالنعم داود، مطبعة الارشاد، بغداد١٩٧٢، ج٤، ق٢، ص٨٥.

٢ - مسكویە، م. س، ج ٥، ص٢٤٩ —٢٥٠. ابن الاثیر، الكامل، ج ٧، ص١٠٨.

٣ - مسكویە، م.ن ، ج ٥، ص٢٥١.

٤ - م.ن ، ج٥، ص٢٥٢. ابن الاثیر، الكامل، ج ٧، ص١٠٩.

٥ - حسین حزنی، كوردستان موكریانی، ل١٩٣.

له سالّی (٣٣٢ك/٩٤٣ن)دا رووسەکان هێرشیان کردە سەر ئاران[١]. دەستیان بەسەر شاری بەردعە داگرت خەڵکێکی زۆریان کوشت و بە ئاراستەی مەراغە هەنگاو یان نا (مرزبان) دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سوپای زیاتر بۆ بەرەنگاربوونەوەی رووسەکان[٢].هاوکات لەگەڵ ئەمەدا(حسین کوڕی سعید)ی حەمدانی سەرقاڵ بوونی(مرزبان) بەشەڕی رووسەکان بەدەرفەت وەرگرت هێرشی بردە سەر ئازربیجان، بەلام لەم هێرشکاریە سەرکەوتوو نەبوو[٣].بەم شێوەیە هەرێمەکانی ئاران و ئازربیجان بەردەوام لە ناسەقامگیری سیاسی دابوو سەرەرای ئەوەش دەتوانین بلێین دەرکەوتنی دەسەلاتی(دیسم)ی کوردی رێ خۆشکەری بوو بۆ سەرهەلدانی میرنشینی رەوادی و شەدادی.

## - رۆژئاوای هەرێمی چیا (غربي اقليم الجيبال)

له راستیدا بارودۆخی هەرێمی چیا وەکو هەرێمی ئازربێجان جۆرێك لە ئاڵ و گۆڕی دەسەلاتی سیاسی بەخۆیەوە بینی، شەڕکردن لە پێناو مانەوەو بالادەستی و زاڵبوون بەشێك بوو لە سیماکانی ئەم هەرێمە پێش دەرکەوتنی میرنشینی حەسنەوەیهی و عەنازی، دەرکەوتنی دەسەلاتی عەیشانییەکان لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی کە فەرمانڕەوایی سنوورێکی فراوانی لە رۆژ ئاوای هەرێمی چیا لەخۆ گرتبوو لە شارەکانی دەینەوەر و هەمەدان، نەهاوەند، صامغان و هەندێ لە دەورو بەری ئازربیجان[٤]. بەلام لەوە دەچێت دەسەلاتی عەیشانییەکان بەپێی هەلومەرجی ناوچەیی و هەرێمایەتیەکان گۆرانی بەسەر دا هاتبێت بە هۆی ململانێ لە نیوان هێزە زاڵبووەکان میرنشینی

---

١ - بۆزانیاری زیاتر لەسەر هێرشکردنی رووس بۆ سەر ئاران، بروانە، شهر یارانی گمنام، ص ص٨٠-٩١.

٢ - مسکویه، م. س، ج ٥، ص٢٦٥ –٢٦٦. ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص١٢٨-١٢٩.

٣- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص١٣٠- احمد كسروى، م.س، ص٨٨-٨٩.

٤ - ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٣٧١.

زیاری[1]، یەکێك بوو لەو هێزانەی کە لەسەر شانۆی سیاسی رووداوەکان لە ئارادابوو کە میر (مرداویج) لە ساڵی (٣١٦ك/٩٢٨ن)دا دوا بەدوای دەست بەسەر داگرتنی شاری قەزوین و رەی، شارەکانی هەمەدان و کنکوڕ و دەینەوەری خستە ژێر دەسەلاتی خۆی، سیاسەتێکی توندی بەکارهێنا بەرامبەر خەڵکی ئەم ناوچانە لە تالانکردن و سوکایەتی پێ کردنیان[2]. لە چوارچێوەی ئەم داگیرکاریانەدا لە ساڵی (٣١٩ك/ ٩٣١ن) کوڕە خوشکی (مرداویج) لەگەڵ سوپایەکی زۆر بەرەو هەمەدان چوون، (ابو عبدالله محمد کوری خلف) هاوشانی سوپای خەلیفە رووبەڕووی بوونەوە لە ئاکامدا کوڕە خوشکەکەی کوژرا، بۆیە (مرداویج) لەشاری رەی بەرەو هەمەدان هات زۆر بە توندو تیژی رەفتاری کرد و خەڵکێکی زۆری کوشت ،هەروا تالانێکی زۆری کرد[3]، وەك کاردانەوەیەك خەلیفە (المقتدر)، (هارون کوڕی غریب)ی نارد بۆ بەرهەڵستی کردنی (مرداویج) لە دەوروبەری هەمەدان بەیەککەیشتن شەڕو کوشتارێکی توند لەنێوانیان رووی دا، سوپای خەلیفە شکستی خوارد[4]. ناوبراوله هەوڵەکانی بەردەوام بوو، بۆ دەست بەسەر داگرتنی وڵاتی کورد لەم چوار چێوەیەدا، (ابن علان القزوینی) بەرەو دەینەوەر

---

١- میرنشینی زیاری، دوای هەرەس هێنانی میرنشینی عەلەوی لە جرجان و تەبرستان دامەزرا کە ناو بنەچەی ئەم میرنشینە دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی (مرداوج کوری زیار)ی دەیلەمی لە ساڵی (٣١٦ك/٩٢٨ز) ئەم میرنشینەی دامەزراند، و لەساڵی (٤٣٣ك/١٠٤١ز) سەلجوقییەکان توانیان کوتایی بەدەسەلاتی زیارییەکان بهێنن. مسکویە، س.پ، ج٥، ص٩١-٩٢ رشید عبدالله الجمیلی، تاریخ الدولة العربیة الاسلامیة، مطبعة التعلیم العالی- بغداد، ١٩٨٩، ص٨٣.

٢ - ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٧٣٢.ابو الفداء، المختصر فی اخبار البشر، المطبعة الحسینیة، القاهرة ١٣٢٥هـ، ج٢، ص٧٣.

٣- م. ن، ج٦، ص٧٥٨. نیشتیمان بشیرمحمد، الاحوال السیاسیةوالاجتماعیةوالاقتصادیة لغربي اقلیم الجبال، خلال القرنین الرابع والخامس الهجریین العاشروالحادی عشرالمیلادیین، رسالة ماجستیر، جامعة صلاح الدین، ١٩٩٤، ص٤٢

٤- ابن الوردی، م. س، ج١، ص٣٩٢. ابن تغری بردی، النجوم الزاهرة فی ملوك مصر والقاهرة، دار الکتب المصریه، القاهرة ١٩٦٣، ج٣، ص٢٢٩.

نارد، دەسەلاتی خۆی سەپاند بەسەر ئەم شارە و تیادا خەلکێکی زۆری کوشت، (مرداویج) درێژەیدا بە فراوان خوازییەکانی لە شارەکانی قرمسین[1] (کرمانشاه) و زبیدیە تا گەیشتە سنووری حولوان و دەورو بەری[2].

ئەو کردەوانەی (مرداویج) دەسەلاتی مەرکەزی ناچارکرد کە دانوستان لەگەڵ ئەنجام بدەن خەلیفە (المقتدر) دانینا بە جیابوونەوەی دەینەوەر و هەمەدان بەرامبەر ناردنی برێکی پارەی سالانە بۆ خەلافەت[3]، بەلام دەسەلاتی (مرداویج) درێژەی نەکێشا بە هۆی دانانی پیلانێك لەلایەن تورکەکانی ئەسفەهان لە سالی (٣٢٣ك/ ٩٣٥ن)دا کوژرا[4] بۆیە (وشمگیر کوری زیار) برای شوێنی گرتەوە بووبە میری زیارییەکان[5]، ئەو بارودۆخە ناجێگیر و شەرو ململانێیە لە رۆژئاوای هەرێمی چیاکان بەردەوام بوو لە نێوان هێزە زالبووەکان بەتایبەتی دوای دەرکەوتنی بوەیهیەکان[6] وەکو هێزێکی دیار لەسەر شانۆی رووداوە سیاسییەکان و هێرشەکانیان بەسەرکردایەتی

---

١ - قرمسین (کرمانشاه)، شارێکی ناسراوە لە نزیك دەینەوەر دەکەوێتە نێوان هەمەدان و حولوان. یاقوت الحموی، م. س، ج٤، ص٣٣٠

٢ - المسعودی، مروج الذهب، ج٤، ص٣٤٠.

٣- ابن الاثیر، الکامل، ج ٦، ص٧٦٠

٤- الصولي، اخبار الراضی بالله والمتقی بالله ، الطبعة الثانیة، دار المسیرة، بیروت ١٩٧٩ ، ص٦٢. المسعودی ، مروج الذهب ،ج٤/ص٢٤١

٥- القرماني، کتاب اخبار الدول وأثار الأول في التاریخ ، عالم الکتب، بیروت (د.ت)، ص٢٦٨. عبدالله رازی، م. س، ص١٨٠

٦ - بوەیهییەکان، لە رەچەلەکدا دەگەرێنەوە بۆ بهرام جور یەکێکە لە مەلیکە کۆنەکانی ئیران. علی کوری بویە کە ناسراوە بە (عماد الدولە) بەیارمەتی سەربازانی دەیلەم توانی بنچینەی دەسەلاتی بوەیهییەکان لەسالی (٣٢٠ك /٩٣٢ز) دابمەزرێنێ لە سالی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) دەست بگرن بەسەرشاری بەغدا لە دەسەلات بەردەوام بوون تا سالی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) لەلایەن سەلجوقیەکانەوە کۆتایان پێهات. ستانلی لین بول، الدول الاسلامیە، ترجمە، محمد صبحی فرزات، علق علیە، محمد احمد دهمان، مکتبە الدراسات الاسلامیە، دمشق ١٩٧٣. ص٢٨٣- ٢٨٥.

(حسن كوڕی بویه) بۆ سەر وڵاتی چیا كه توانیان دەست بەسەر هەندێك لە شارەكانی هەرێمی چیادابگرن و بەرەنگار بوونەوەی(وشمگیر) لە پێناو مانەوەی و درێژەدان به دەسەلاتی له شارەكانی هەمەدان و قوم و قەزوین و چەند ناوچەیەكی تر[1]. بە شێك بوو لە و فراوان خوازی و داگیركارییانە، بێگومان بوونی شەڕو ململانێ لە نێوان دووهێزی وەكو بوەهییەكان و زیارییەكان لەسەر خاكی كورد، زەرەروزیانی یەكجار زۆری هەبوو لەڕووی ئابووری و كۆمەڵایەتی و ناسەقامگیری سیاسیی و ئاسایشی نەتەوەیی.

لەم بارودۆخەدا هۆزی شاذنجاني كوردی بۆ كۆنترۆلكردنی ڕێگای بازرگانی خەریكی كرداری تاڵانكردن بوون لەو كاروانە بازرگانییانەی كە لە بەغداوە بەرەو خوراسان تێدەپەرین[2]، بەڵام ئەوەی بارودۆخەكەی خراپتر كرد هێرشكاری سامانییەكان[3] بوو بۆ سەر شارەكانی رۆژئاوای هەرێمی چیا وەكو هێزی سێیەم دەركەوت لە نێوەندی ململانێی كایە سیاسی و سەربازییەكاندا.

(ابو علی كوڕی محتاج) سەركردەی سوپای سامانی لە خوراسان دوای داگیر كردنی شاری رەی و شكست خواردنی (وشمگیر) بەرەو وڵاتی چیا هات، لەساڵی (٣٣٠ك/٩٤١ن)دا شارەكانی قەزوین، قوم، كرج، نهاوەند و دەینەوەر تا سنووری حولوان دەستی بەسەرداگرت[4]، دەبینین لە ساڵی (٣٣٣ك/٩٤٤ن) جارێكی تر(ابو علی) بەرەو شاری رەی دێت،(ركن الدولە) ی

---

١ - ابن الاثیر، الكامل،ج ٧، ص٤٤.

٢- الصولي، م. س، ص١٩٢.

٣ - سامانییەكان، خێزانێكی فارسی بوون له شاری بلخ له وڵاتی ئەو دیوی رووبار كه (نصر كوری احمدی سامانی) دوای لە ناوچونی دەسەڵاتی طاهیرییەكان توانی لە ساڵی (٢٦١هـ/٨٧٤م)دا میرنشینی سامانی دابمەزرێنێ بە شێوەیەكی پشتاو پشت لە دەسەڵات بەردەوام بوون تا ساڵی (٣٨٩هـ/ ٩٩٩م) كۆتای هات، ستانلی بول ( الدول الاسلامیة) ص٢٦٨-٢٦٩.

٤ - ابن الأثیر ، الكامل،ج٧، ص١٠٩.

بوەیهی کاتێك دەزانی کە سوپایەکی زۆری لەگەڵدایە لەم شارە پاشەکشە دەکات، بۆیە (ابو علی) تەواوی شارەکانی هەرێمی چیا دەخاتە ژێر دەسەڵاتی و نوێنەری خۆی لەم شارانە دادەنێ[1]. دیارە لەم هەرێمەدا گۆڕانی دەسەڵات و ئاڵوگۆڕکردنی زوو بەزووی هاتۆتە ئاراوە ئەمەش پەیوەست بووە بە خودی هێزەوە بەهێزی بۆتە هۆی زاڵبوون و باڵادەستییەوە بێ هێزی بۆتە هۆی پاشەکشەکردن و پووکانەوە.

**- هەرێمی جەزیرە:**

بارودۆخی ئەم هەرێمە تارادەیەك جیاوازی هەبوو لەگەڵ هەرێمەکانی تر بەهۆی هەڵکەوتی شوێنی جوگرافی کە پێگەیەکی سنووری هەبوو، کەوتبووە نێوان دەوڵەتی بێزەنتینی لەلایەك و چوار چێوەی دەوڵەتی ئیسلامی لەلایەکی ترەوە، گۆڕەپانێك بوو بۆ شەڕو ململانێی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە.

بەهۆی لاوازی دەوڵەتی عەبباسی میرنشینی حەمدانی لە ساڵی (٢٩٣ك/٩٠٥ز)دا لە شاری موصل دەرکەوت[2]، کە سنووری ئەم میرنشینە جگە لە موصل و دەوروبەری هەرێمی جەزیرەشی لە خۆگرتبوو، حەمدانییەکان پەیوەندییەکی سەقام گیریان نەبوو، لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسی، لە ساڵی(٣٠٣ك/٩١٥ز) دا (حسین کوڕی حمدان) لە جەزیرە لە گوێڕایەڵی خەلیفە (المقتدر) دەرچوو بە هۆی نەدانی باج و ماڵ و دارایی ئەو هەرێمە بە دەسەڵاتی مەرکەزی ئەمەش ئاکامەکەی شەڕی لێکەوتەوە کە بەشکستی (حسین کوڕی حمدان) کۆتایی هات[3]، جگە لەوە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی خەواریج لە هەرێمی جەزیرە کاری گەری خۆی هەبوو لە تێکدانی

---

١ - م. ن، ج٧، ص١٥٩ _ زرار صديق توفيق ، الكورد في العصر العباسي حتى مجئ البويهيين ، رسالة ماجستير، كليةالاداب – جامعة صلاح الدين. أربيل ١٩٩٤ ،ص١٧٨.

٢ - ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٥٤٧.

٣ - الطبري، م. س، ج٦، ص٣١-٣٢. ابن الأثير، م. ن، ج٦، ص٦٣٩-٦٤٠.

ئارامی ئەم هەرێمە کە حەمدانییەکان رۆڵێکی کاریگەریان گێرا بۆ زاڵ بوون بەسەر خەواریجەکان وەکو بزووتنەوەی (صالح کوڕی محمود) کە هەڵدەستا بە وەرگرتن و کۆکردنەوەی پارەو و سامان لە خەڵکی سنجار (شنگال)، بەڵام (نصر کوڕی حمدان) توانی بەرهەڵستی بکات کۆتایی بەم بزووتنەوەیە بهێنێ[1]، هەروەها بزووتنەوەیەکی تری خەواریجییەکان لە هەرێمی جەزیرە لەلایەن (الاغر کوڕی مطرة الثعلبی) لە سالّی (٣١٨ك/٩٣٠ز)دا دەرکەوت بەرەو شاری نصیبین هات،و شکستی بەوالی ئەم شارە هێناو خەڵکێکی زۆری دەستگیر کرد، سەرنجام (ناصر الدولە کوڕی حمدان)، توانی دەستگیری بکات ناردی بۆ بەغدا[2]

حەمدانییەکان رۆڵێکی کاریگەریان گێڕا لەبەربەست کردنی هێرشکارییەکانی سوپای رۆمە بێزنتییەکان بۆ سەر شارەکانی جەزیرە[3]، کە چەندین جار هێرشیان هێنابووە سەر ناوچەکانی ئامەد، میافارقین، ئارزن و چەندین ناوچەی تر، کەتێیدا کوشتاری زۆریان ئەنجامدابوو[4] جارێکی تر فاکتەری ماددی دەبێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندی نێوان خەلافەتی عەبباسی و حەمدانییەکان کاتێك خەلیفە (الراضی) لە سالّی (٣٢٧ك/٩٣٨ز)دا میری میران (بجکم) دەنێرێتە موصل بۆ بەرەنگار بوونەوەی (حسین کوڕی عبدالله کوڕی حمدان) لە ئاکامدا شکست دەخوات سوپای عەبباسی تا شاری

---

١- ابن الأثير، الكامل، ج٦، ص٧٥٢.

٢ – م. ن، ج٦، ص٧٥٣.

٣ - ابن تغري بردي، م. س، ج٣، ص٢٥٨-ص٢٧٨. رشيد عبدالله الجميلي، م. س، ص١٦٣.

٤ - ابن الجوزي، المنتظم فی تواريخ الملوك والامم، دراسة وتحقيق، محمد عبد القادر عطا و مصطفى عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت ٢٠٠٠، ج١٤، ص١١٤ - سبط ابن الجوزي، مرأة الزمان في تاريخ الأعيان حوادث (٣٤٥-٤٤٧هـ)، دراسةوتحقيق، جنان جليل محمد الهموندى، الدار الوطنية، بغداد ١٩٩٠ ص١٠٠ص١٠٤. ابن العماد، شذرات الذهب ، ج٤، ص٢٤٧.

نـصيبين شـوێنی کـەوتن، بۆیـە ناچـار دەبێـت هـەڵبێت بـەرەو ئامـەد دواتـر پەیوەندی نێوانیان بەرەو ئاشتبونەوە چوو[1].

سیمای ئەو هەرێمە بە شێوەیەکی گشتی سـەقام گـیر نـەبوو بـە هـۆی هێرشی رۆمە بزنتییـەکان لەلایـەك کـە هـەرکاتێك دەرفـەتێکیا بـۆ هەڵکـەوت بوایە هێرشیان دەهێنایە سەر هەرێمی جـەزیرە، شـارەکانیان تـالآن دەکـردو خەڵکی زۆریان دەکوشت،ئەمەش کاریگەری خراپـی هـەبوو لەسـەر تێکـدان و شڵەژانی بارو دۆخی شارەکانی جەزیرە.

لەلایەکی کە زۆر جار شەڕی نێوان دەوڵەتی عەبباسی و حەمدانییەکان کاردانەوەی خراپـی لەسـەر ئـەو هەرێمـە هـەبوو شـارەکانی وەکـو پێگەیـەك لەلایەن حەمدانییەکانەوە، بەکار دەهات.

---

١ - الـصولي: م. س، ص١٠٨- ١٠٩. ابـن الـوردي، م. س، ص٤٠٥. ابـن تغـري بـردي، م. س ،ج٣، ص٢٦٤.

## تەوەرەی سێیەم

## ناساندنی میرنشینە کوردییەکان

لێرەدا دەمانەوێ بە کورتی ئاماژە بەو میرنشینانە بکەین کە لە سەردەمی عەبباسیدا سەریان هەڵداوە و هەر لەم سەردەمەشدا رووخان، تەنها لە رووی سنووری دەسەلات، میرنشینەکە و ئەو ناوچەی کە تێدا نەشونمان کردووە و گرینگترین ئەو شارو هەرێمەی کە تێیدا بالآدەست بووە ،ئەو هۆزو خێڵەی کە بۆتە بنەماو پێکهاتەیەك بۆی و کات و ساتی دەسپێکی میرنشینەکە و گرنگترین ئەو سەرکردانەی کە رۆڵیان هەبووە لە پاراستنی کیان و سنووری دەسەلات، هەرێمەکانی چوارچێوەی میرنشینەکانیان دیاریکردنی کات و ساڵی سەردەمی رووخانیان.

لە راستیدا مەبەستمان تەنها ناساندنی مێژووی میرنشینەکەیە لە سنووری جوگرافیاکەی خۆی باسی مێژووەکانیان خۆمان لێدەپارێزین، لەبەرئەوەی هەریەك لەم میرنشینانە لە رابردوو لێکۆڵینەوەی و توێژینەوەی تایبەتی زانستی لەسەر کراوە[1]

---

١ - بۆ نموونە: محمود یاسین التکریتی، الامارة المروانیة فی دیاربکر والجزیرة،رسالة ماجستیر مقدمە الی کلیەالاداب- جامعە بغداد ،بغداد ١٩٧٠،حسام الدین علی غالب النقشبندی ،الکرد فی الدینور وشهرزور، رسالة ماجستیر مقدمە الی کلیەالاداب- جامعە بغداد ،بغداد ١٩٧٥، اذربیجان دراسة سیاسیة حضاریة، اطروحة دکتورا مقدمە الی کلیەالاداب -جامعە بغداد، بغداد ١٩٨٤- اسماعیل شکر رسول ،الشدادیون فی بلاد اران، رسالة ماجستیر مقدمە الی کلیەالاداب- جامعە صلاح الدین اربیل ١٩٩٠-احمد عبد العزیز، الامارة الهذبانیة الکردیە ، رسالة ماجستیر مقدمە الی کلیەالاداب -جامعة صلاح الدین ، اربیل ١٩٩٠ فرست مرعي ،الامارات الکردیة فی العصر العباسی الثاني ،اطروحة دکتوراه مقدمة الی مجلس کلیةالاداب- جامعةصنعاء، الیمن ٢٠٠٠.

## میرنشینی حەسنەوەیهی (٣٤٨ – ٤٠٦ك/٩٥٩ – ١٠١٥ز)

میرنشینی حەسنەوەیهی[١] لەلایەن (حسنویە کوڕی الحسین)ی کوردی بەرزیکانی دامەزراوە[٢]، لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٨ ك/٩٥٩ن)[٣]دا، یاخود لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی دەیەمی زاینی[٤] بوو لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا دەسەڵاتەکەی سنوورێکی فراوانی لەخۆ گرتبوو، کە پێکهاتبوو لە شارەکانی (دەینەوەر، هەمەدان، قرمسین(کرمەشان) و نەهاوەند، بروجرد،ماسبذان، ،اسداباد، شابورخواست،صامغان و چەند ناوچەیەکی تر[٥]، دەبێت ئەوەش بڵێین سنوور و دەسەڵاتی میرنشینە کوردەکان بەشێوەیەکی گشتی جێگیر نەبووە، واتا بەردەوام سنوورێکی دیاری کراوی نەبووە،بەڵکو بەپێی بەهێزی و لاوازی گۆڕانی بەسەر داهاتووە کاتێك دەسەڵاتی بەهێز بووە سنوورەکەشی فراوان بووە، بەپێچەوانەشەوە کاتێك میرێکی لاواز و بێ توانا فەرمانڕەوایی کردووە پێگە جوگرافیەکەشی کەم

---

١ - بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ حسام الدین علي غالب النقشبندي، الکرد فی الدینور و شهرزور،ص١٣٠- ١٩٤. فرست مرعي،الامارات الكردية فی العصر العباسی الثاني،ص١٣٥-٢١٩

٢- استانلی لین بول، الدول الاسلامية ، ص٢٨١- کی لسترنج ،بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة، بشير فرنيس و کورکیس عواد، مطبعة الرابطة – بغداد ١٩٥٤م ،ص٢٢٤- م.س لازرايف، تاريخ کردستان ،ترجمه عن الروسية عبدی حاجی، مطبعة حاجی هاشم، اربيل، ٢٠٠٦،ص٥٢.

٣ - زامباور ،معجم الانساب و الاسرات الحاكمة فی التاريخ الاسلامی ، اخرجه، زکی محمد حسن بك و حسن احمد محمود، مطبعة جامعة فؤادالاول، القاهرة ١٩٥١،ج٢، ص٣٢١- اسانلی لین بول،طبقات سلاطين الاسلام، حققه، علی البصری، دارمنشورات البصری، بغداد، ١٩٦٨م، ص ١٣٣. واسیلی نیکیتین ، کوردو کوردستان ،وەرگێڕانی خالیدی حسامی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحدین، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٢٨

٤ - فرست مرعي، الامارات الكردية فی العصر العباسی الثاني ،ص ١٣٩.

٥ - حسام الدين علي غالب نقشبندي،الکرد فی الدينور و شهرزور ،ل٥٤.جليلة ناجی الهاشمی، الامارة الحسنوية فی الدينور و الشهرزور، مجلة المجمع العلمی العراق –الهيئة الكردية، المجلد(٣)، العدد(١)، بغداد، ١٩٧٥م، ل٧٣

بۆتەوە.لەگەڵ ئەوەی یەکێك لە توێژەران ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەست پێکی ئەم میرنشینە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣٣٠ك/٩٤١ز) بە فەرمانڕەوایی (الحسین)ی باوکی (حسنویه)[1]، بەلاَم ئەم بیروڕایە تارادەیەك لە راستییەوە دوورە، چونکە سەرچاوە رەسەنەکان باس لەمە ناکەن.

میر (حسنویه کوڕی الحسین) پاش فەرمانڕەوایی کردنی نزیکەی بیست ساڵ لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) کۆتایی بە ژیان و دەسەلاَتی هات[2].بۆیە وەکو نەریتی هەمیشەیی لە سیستەمی پشتاو پشت کوڕەکەی بەناوی (بدر)دەبێت بە جێنشینی و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی جێنشین دەبێت[3].لەگەڵ هەموو ئەو کێشە ناوخۆیی و ململانێیە دەرەکیانە رووبەڕووی بۆوە توانی بۆ ماوەی ٣٦ ساڵ فەرمانڕەوایی میرنشینی حەسنەوەیهی بکات، لە دواجار (بدر کوڕی حسنویه) لە ساڵی (٤٠٥ك/١٠١٤ز) دەکوژرێت[4].سەرئەنجام (طاهر کوڕی هلال) توانی جێگای باپیرەی بگرێتەوە تەنها بۆ ماوەی یەك ساڵ توانی درێژە بە فەرمانڕەواییەکەی بدات کە سەردەمی ئەم میرەش پڕ بوو لە شەڕو ململانێ تا لە ساڵی (٤٠٦ ك/١٠١٥ز)دا (طاهر) دەکوژرێت[5]، دەبێت بە دوایین میر و کۆتایی بە میرنشینی حەسنەوەیهی دێت.

---

١ - حسین حزنی موکریانی ،اورێکی پاشەوە،حوکمەتی بەرزەکان، بەندی دووەم،رەواندوز ١٩٢٩،ل٤ — بابا مردوخ روحانی، تاریخ مشاهر کرد ، چاپ دوم،چاپخانه انتشارات سروش، تهران ١٣٨٢،ص٤٣.

٢ - مولف مجهول: مجمل التواریخ والقصص ،بتصحیح ملك شعراء بهار، دارنده کلاله خاور (تهران ١٣١٨ هـ.ش)، ص٣٩٤- ابن الاثیر ،الکامل،ج٧،ص٣٧٠.ابن خلدون، العبر، ج٨، ص١٠٩٤ —، شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێرانی، هەژار، چاپخانەی ناراس، چاپی سێهەم، هە ولێر، ٢٠٠٦، ل٣٤. کی لسترنج، م. س، ص٢٢٤.

٣ - ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٣٧٦- ستانلی لین بول، الدول الاسلامیة، ص٢٨١

٤ - سبط ابن الجوزي، م. س، ص ٢٩٦- ٢٩٧. ابن الأثیر، الکامل ج٧، ص٥٩٦. ابن خلدون، العبر، ج٨، ص١١٠٠.

٥ - ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص٦٠٨. ابن خلدون، العبر، ج٨، ص١١٠١.

## میرنشینی شەدادی[1] (٣٤٠ – ٤٦٨ك/٩٥١ – ١٠٧٥ز)

فــەرمانڕەوایی میرنــشینی شــەدادی[2] لەهــەرێمی ئــاران لــە ســاڵی (٣٤٠ك/٩٥١ز) دا بە هەوڵ و كۆششی (محمد كـوڕی شـداد) دەركـەوت[3]. كە دەستپێكی ئەو میرنشینە لەشاری دبیل[4] بوو[5]، بەلاَم فەرمانڕەوایی (محمد) درێژخایەن نابێت كاتێ (سـالار مرزبـان) لـە سـاڵی (٣٤٣ ك/٩٥٤ز)دا هێـرش دەكاتە سەر دبیل بۆیە (محمد كوڕی شداد) بە ناچاری پاشەكشە دەكات ئەم شارە بـەجێ دەهێلێـت[6].دوە لـە سـاڵی (٣٤٤ ك/٩٥٥ز)دا (محـمـد) دەمرێـت و[7]كوڕە گەورەكەی بەناوی (ابو الحسن لشكری) دەبێتە جێنشینی لە سـاڵی (٣٦٠ك/٩٧٠ز)دا فەرمانڕەوایی میرنشینی شەدادی دەگرێتە ئەستۆ[8]. دیارە لە ماوەی نێوان ساڵانی (٣٤٣ك–٣٦٠ك/٩٥٤ز–٩٧٠ز) دا (مرزبان) دەسەلاَتی خـۆی سـەپاندۆتەوە بەسـەر هـەرێمی ئـاران دا، بۆیـە مێـژوو نوسـان سـاڵی

---

١ - میرنـشینی شـەدادی، نـاو بنەچـەكەی دەگەڕێتـەوە بـۆ (شـداد كـوڕی قرطق) كە بـاب و باپیرەی فەرمانڕەوایانی شەدادین لەبنەچەدا كوردانی ڕەوادیـن كـەتیرە یـەكن لـە هـۆزی هـەزەبانی. قادرمحمدحـسین، الامـارات الكوردیـە فـی العهـد البـویهی، رسـالة ماجـستیر مقدمة الی كلیةالاداب-جامعه صلاح الدین، اربیل، ١٩٩٩، ص٢٨

٢- بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ اسماعیل شـكر رسـول، الامـارة الـشدادیة الكردیـة فـی بـلاد ئاران دراسة سیاسیة حضاریة، مؤسسة موكریانی، اربیل، ٢٠٠١، ص ٦٩-٧٤.

٣ - احمد كسروی، م. س،ص٢٥٩.

٤ - دبیل، شارێكە لەئەرمینیا لە سەر سنووری ئاران. یاقوت الحموي، م. س، ج٢، ص٤٣٩

5 -minorsky, studies in Caucasian history"Printed in Great Britain"London 1953 pp.8-9

٦ - اسماعیل شكر، الامارة الشدادیة الكردیة ، ص ٦٩. minorsky, studies ,p.11

٧ - منجم باشی، جامع الدول-باب فی الشدادیة، تحقیق، مینورسكی، كامبردج١٩٥٨،ص٦. احمد كسروی، م.س ،ص٢٦٨.

٨ - احمد كسروی، م. س ،ص٢٦٨-طـارق محمـد عبـدالرحیم، المستـشرق فلادیمـیر مینورسـكی وكتاباتـة عن الكرد فی العصر الاسلامی، دراسـة نقدیـة، مؤسـسة موكریـانی، اربیـل ٢٠٠١، ص١٢٢.

(٣٦٠ك/٩٧٠ن) بـه دەسـتپێكی دەسـەڵاتی (لـشكری) دادەنـێن و بـۆ مـاوەی هەشـت سـاڵ بـەردەوام دەبێـت لـە دەسـەڵات تـا سـاڵی (٣٦٨ك/٩٧٨ن) دەمرێت[١]. بۆیە براكەی بـە نـاوی (مرزبـان كـوڕی محمـد) دەبێـت بـە مـیری شـەدادی، بـەڵام لـە سـاڵی (٣٧٥ك/٩٨٥ن)، دەكـوژرێ[٢]. سەرەنجام(فضلون)ی برای فەرمانڕەوایی میرنشینەكەی وەردەگرێت لە ساڵی (٣٧٥ك/٩٨٥ن)دا[٣] ئەم میرە یەكێك بووە لـە سـەركردە نـاودارو بـەهێزەكان بۆیە هەندێ لە مێژوونووسان بـە دامەزرێنـەری دووەمـی میرنـشینی شـەدادی دادەنێن كە دەسەڵاتی تەنها خاكی ئارانی نەگرتبۆوە، بەڵكو بەشـێكی زۆری لـە ئـەرمینادا خـستە ژێـر فـەرمانڕەوایی خـۆی[٤] و پـاش تێپـەڕبوونی چـل و حەوت ساڵ لە فەرمانڕەوایی لە ساڵی (٤٤٢ك/١٠٣١ن) دا دەمرێت. دوای خۆی كوڕەكەی بەناوی (ابو الفـتح موسـی) حوكـومڕانی دەگرێتـە دەسـت كـە سـێ ساڵ فـەرمانڕەوایی دەكـات[٥].لـە سـاڵی (٤٢٥ك/١٠٣٤ن)دا (ابـو الحـسن علـی كوڕی موسی)كە ناسراو بە (لشكری) دووەم دەبێتە میری میرنشینی شەدادی بۆ ماوەی پازە ساڵ فەرمانڕەوایی دەكات تا دوا ساتی ژیانی لـە سـاڵی (٤٤٠ ك/١٠٤٨ن) دا[٦]. دواتر (انوشیروان)ی كوڕی هاتـە جێگـەی، بـەڵام مـاوەی

---

1 - Minorsky studies in Caucasian history. p.16

٢ - احمد كسروی، م. س، ص٢٦٩- محمد امین زكی، تاریخ الدول والامارات الكردیة فی العهد الاسلامي، عربه وراجعه، محمد علی عوني، بغداد ١٩٤٥، ص٩١.

٣ - روس، ماده بنو شداد، دائرة المعارف الاسلامیة، مج١٣، ص١٨٢

٤ - احمد كسروی، م. س ، ص٢١٩- حسین حزنی ،كوردستانی موكریـانی، ل٢٩١، جمـال رشـید احمد، بەیەكگەیشتنی كورد ولان لە ولاتی باب و شەروان ،وەرگێرانی ئاسۆس محمد مـلا قادر ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ٢٠٠٤، ل٢١٧.

٥ - روس، مـادة بنـو شـداد ، دائـرة المعـارف الاسـلامیة، مـج١٣، ص١٨٢. احمـد كـسروی،م. ن، ص٢٧٣.

٦ - منجم باشی ،جامع الدول، ص١٢. احمد كسروی، م. ن، ص٢٧٤

فەرمانڕەوایەکەی کورت خایەن بوو، دوای چەند مانگێك وەفاتی کرد[١]، ئینجا (ابو السوار ساور کوڕی فضلون) بوو بە فەرمانڕەوا لە ساڵی (٤٤١ك/١٠٤٩ن)دا، کە یەکێکە لە میرە بەناوبانگەکانی میرنشینی شەدادی[٢] بەلاَم لە سەردەمی ئەو میرەدا سەلجوقییەکان وەکو هێزێکی نوێ لە هەرێمە کوردییەکان بەدەرکەوتن[٣]. (ابوالسوار) بۆ ماوەی (١٨) ساڵ بەردەوام بوو لە فەرمانڕەوایی و لە ساڵی (٤٥٩ك/١٠٦٧ن)دا کۆچی دوایی دەکات[٤]. بۆیە دەسەلاَتی بنەماڵەی شەدادی دەکەوێتە دەست کوڕی (ابوالسوار) بەناوی میر (فضلون)ی دووەم وەکو جێنشینی باوکی دەست بەکار دەبێت[٥]. لەڕاستیدا لەسەر سات و ساڵی نەمانی میرنشینی شەدادی بیر و ڕای جیاواز هەیە لەگەڵ ئەوەی کتێبی (جامع الدول) ئاماژە بەوە دەکات کە میرنشینی شەدادی لەساڵی (٤٦٨ك/ ١٠٧٦ن) دەکەوێتە ژێردەسەلاَتی دەست تورکە سەلجوقییەکان (فضلون) ولاَتی ئاران دەدات بەدەست ساوتکین کە نوێنەری (الب ارسلان) بوو[٦].بەلاَم لەگەڵ کەم بوونەوەی سنووری جوگرافی ئەم میرنشینە توانی لە شاری ئانی[٧] درێژە بە فەرمانڕەوایی خۆی بدات تا ساڵی (٥٩٥ك/١١٩٨ن) دا[٨]، وە دەکرێت بگوترێت لەگەڵ ئەوەی بنەماڵەی شەدادی لەم شارە بە شێوەیەکی پشتاو پشت بەردەوام بوونە، بەلاَم بە جۆرێك لە جۆرەکان گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاندووە.

---

١ - بابا مردوخ روحانی، م. س ،ص٧٣- روس، مادة بنو شداد ، دائرة المعارف الاسلامية، مج١٣، ص١٨٢.

٢ - احمد کسروی ، م. س ،ص٢٨٥، Minorsky, studies ..P.19

٣ - ابن الاثير، الکامل،ج٨ ، ص١١٦

4- Minorsky studies,P22.

٥ - کسروی، م. س، ص٢٩٧- حسين حزنی، کوردستانی موکريان ،ص ٢٣٢.

٦ - منجم باشی ، جامع الدول ، ص ١٨. محمد امين زکی ، الدول والامارات الکردية ،ص٩٢

٧ - ئانی، شارێکە لە ئەرمینیا دەکەوێتە لای ڕاستی کەنار ڕووباری ارپاتشای. برتولد، مادة أنی، دائرة العارف الاسلامية، مج٢، ص٨٥

٨- احمد کسروی ، م. س، ص٢٠٨-٢١٨. بابا مردوخ روحانی ، م. س ، ص ٨١-٨٥.

## میرنشینی ڕەوادی (٣٤٣ – ٤٦٣ك/ ٩٥٤- ١٠٧٠ز)

میرنشینی ڕەوادی[١] دەگەڕێتەوە بۆ تیرەی ڕەوادی لە هۆزی هەزبانی[٢] وەکو (ابن الاثیر) ئاماژەی بۆ دەکات ڕەوادییەکان لە شەرەف مەندترین کوردەکانن[٣].کە توانیان لە هەرێمی ئازربیجان لە ساڵی (٣٤٣ك/١٠٤٣ز)دا میرنشینێك دابمەزرێنن[٤]، دەسەلاتی ئەم میرنشینە سنوورێکی فراوانی گرتبۆوە لە هەرێمی ئازربێجان، کە پێکهاتبوو لە شارەکانی (مراغە، تەبریز، ئەردبیل، میانج، ئورمیە، خوی، سلماس، مرند، چەند ناوچەیەکی تر لە خۆوە دەگرێت[٥]. کە (محمد کوڕی الحسین)ی ڕەوادی یەکەم کەس بوو لەم بنەماڵەیەکە فەرمانڕەوایی کردووە، بەدامەزرێنەری میرنشینی ڕەوادی دادەنریت، کە سەرەتا لە هەندێ ناوچەی ئەرمینیا فەرمانڕەوایی دەکرد، پاشان شوێن پێگەی دەسەلاتی فراوان بوو زۆربەی ناوچەکان ئازربیجانی گرتەوە[٦]. بەلام ماوەی فەرمانڕەواییەکەی درێژخایەن نەبوو، بۆیە دوای مردنی میر (محمد) کوڕەکەی (ابوالهیجاء حسین کوری محمد)ی روادی دەبێت بە میراتگری و دەسەلات دەگرێتە دەست لە ساڵی (٣٤٥ك/٩٥٦ز) دەستی

---

١ - بۆ زانیاری زیاتر لە سەر میرنشینی روادی بگەرێوە بۆ،حسام الدین علی غالب النقشبندی ، اذربیجان ،ص ص١٣٢-١٧٧.

٢- ابن خلكان، وفيات الاعيان و انباء أبناء الزمان، تحقيق، يوسف علي طويل و مريم قاسم طويل، دارالكتب العلمية، بيروت ١٩٩٨م، ج٧،ص١٣٩.

٣ - التاريخ الباهر فى الدولةالاتابكية بالموصل، تحقيق، عبدالقادر احمد طليمات ،دار الكتب الحديثة، القاهرة ١٩٦٣، ص ١١٩.

٤ - حسام الدين على عالب النقشبندى ،اذربيجان، ص١٣١. جمال رشيد احمد، س. ث، ل٢١٠. نیشتیمان بشیر محمد، کوردو سەلجوقیەکان، وەرگێرانی ئیدریس عەبدوللا مستەفا، چاپخانەی موکریان، هەولێر ٢٠٠٦، ل٢٥.

٥ - اليعقوبى، كتاب البلدان ،دار احياء التراث العربى ،بيروت، ١٩٨٨م، ص٤١.ابن خرداذبه، المسالك و الممالك ، طبع فى مدينة ليدن المحروسة بمطبعة بريل، دار صادر، بيروت، ١٨٨٩م، ص١١٩.

٦ - مینورسکی، پژو هشهایی در تاریخ قفقاز، ترجمة، محسن خادم،تهران ١٣٧٥، ص٢٢١

بەســـەر تـــەبریز داگـــرت و بـــارودۆخی شـــارەکەی ڕێکخـــست و لـــە ســـاڵی (٣٥٠ك/٩٦١ن)دا کردی بەبنکـەی فـەرمانڕەوایی میرنـشینی ڕەوادی[١]. نـاوبراو لە ساڵی (٣٧٨ك/ ٩٨٨ن)دا دەمرێت، بۆیە کوڕەکەی مملان (محمد) دەسـەلآت دەگرێتە دەست و دەبێت بە جێنشینی کە ناودارترین و بەهێزترین میر بووە لە میرنـــشینی ڕەوادی[٢]، فـــەرمانڕەوایی بـــەردەوام دەبێـــت تـــا لـــە ســـاڵی (٣٩١ك/١٠٠٠ن) کۆچی دوایی دەکات، سەرەنجام کوڕەکەی بە ناوی (ابـو نـصر حسین کوڕی محمد) جێگای دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی کـە زانیـاری زۆر کەمـە لەسەر ئەم میرە، بەلآم ئاماژە هەیە کە لـە سـاڵی ( ٤١٦ك/١٠٢٥ن)دا مـردووە، لێرەدا براکەی (ابو منصور وهسوذان کوڕی محمد) دەسـەلآتی وەرگـرت و بـوو بە فەرمانڕەوا[٣].

بەلآم بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە لە نێوان توێژەرانی مێژوویی لـە سـەر کاتی وەرگرتنی دەسەلآتی ئەو میرانە و ساڵی مردنیـان[٤]، دیـارە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی (ابـو منـصور وهـسوذان)، ئازربیجـان ڕووبـەڕووی هێرشـکاری هـۆزی غـوز ی تـورك بۆتـەوە[٥]. ئـەم مـیرە مـاوەی دەسـەلآت داریەکـەی درێژخایـــەن بـــووە لـــە ســـاڵی(٤٥١ك/١٠٥٩ن)دا مـــردووە[٦]. لەســـاڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ن)دا سوڵتان (طغرلبك) بڕیاری دا (مملان کوڕی وهسوذان کـوڕی

---

١ - مینورسکی، تـاریخ ققفـاز، ص٢٤١- جمـال رشـید احمـد س.پ، ل٢١.جـواد مـلا، کردستان والکرد وطن مقسم وامة بلا دولة، تقدیم، جمال نبز، الطبعة الثانیة، دار الحکمـة، لنـدن ٢٠٠٠م، ص ٤٠

٢ - احمد کسروی، م. س ، ص ١٧١-١٧٢. بابامردوخ روحانی ، م. س، ص ١٧

٣ - مینورسکی، تاریخ ققفاز،ص ٢٤٢.

٤ - ناصر خسرو ، حکیم ناصر بن حسرو قوبادیانی مرونی(٣٩٤-٤٨١هـ) سفرنامه، به کۆشش نادر وزبن ثور،تهران ١٣٧٣ش، ص١٢٧ - احمد کسروی، م. س، ص١٨٠ - مینورسـکی، م. ن، ص٢٤٢- زامباور، م. س ،ج٢،ص٢٧٦

٥- ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص٧١٨- احمد کسروی،م.ن، ص١٨٣-٢٠١ — حسین حزنی، کوردستانی موکریان، ل ل٢٦١- ٢٧٧.

٦ - مینورسکی، تاریخ ققفاز،ص ٢٤٢. حسام الدین النقشبندی، اذربیجان، ص١٧١

مملان) ببێت بە جێنشینی باوکی لە ئازربیجان[1]. بەڵام هۆکاری ئەم بڕیارەی سوڵتان (طغرلبك) بە دانانی (مملان)لە شوێنی (ابو منصور وهسوذان)ی باوکی بەر لە مردنی بە ساڵێك نەزانراوە.

میر(مملان) تا ساڵی(٤٦٣ك/١٠٧٠ز) فەرمانڕەوایی ئازربیجانی کردووە، دواجار سوڵتان (ألپ ارسلان) لەم ساڵە دا (مملان) و کوڕەکانی دەست گیرکرد[2] بەم شێوەیە میرنشینی ڕەوادی لە ئازربیجان کۆتایی پێهات.

## میرنشینی مەروانی (٣٧٢- ٤٧٨ك/٩٨٢ — ١٠٨٥ز)

میرنشینی مەروانی[3]لەلایەن (ابو عبداللە الحسن کوڕی دوستك)[4]، ناسراوە بە (باد)ی کوردی[5]دامەزرا. بیروڕای جیاواز هەیە، لەسەر ئەو خێڵەی کە میر (باد) ی بۆ دەگەڕێتەوە هەریەك لە( ابن شداد) و(الروذراوري) و (ابن الاثیر)و (ابن العبري) ئاماژە بەوە دەکەن کە ( باد)لە هۆزی حەمیدیە[6]، بەڵام فارقی بە خاربختی ناوزەندی دەکات[7].

---

١ - ابن الاثیر، الکامل، ج٨،ص١٦٢- مەنسور مەخدوم، گرنگی کوردو کوردستان لە قۆناغە مێژووییەکانی ئێران تاسەردەمی ئەفشاریە، وەرگێرانی،رەفعەت موڕادی، چاپخانەی روون، سلیمان (ب.س)، ل٨٨.

٢ - مینورسکی، تاریخ قفقاز،ص ٢٤٢-٢٤٣.

٣- بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ ،محمود یاسین التکریتی، الامارة المروانیة فی دیار بکر و جزیرة ،ص٥٦-١٠٨- فرست مرعي، م. س ،ص٢٢٣-٣٢٨ عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة فی کردستان الوسطی، مطبعة الواء —بغداد ١٩٧٢، ج١، ص٨٤-٣٢٥.

٤ - الفارقي، تاریخ الفارقي الدولة المروانیة،دارالفکر للطباعةوالنشر، القاهرة، ١٩٧٩ ص٤٩-٥٠. ابن الاثیر، الکامل،ج٧،ص ٤٠١. ابن خلدون ،العبر ،ج٧،ص٦٧٤

٥- الفارقي، م.ن ،ص٥٠- ابن الاثیر، الکامل ،ج٧،ص٤٠١-ابن شداد، الاعلاق الخطیرة فی ذکر امراء الشام والجزیرة، تحقیق، یحیی عبارة، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٧٨م، ج٣، ق١، ص٣٢٧

٦ - الروذراوري، ذیل تجارب الأمم، دار الکتب العلمیة، بیروت ٢٠٠٢، ج٦، ص٥٢. ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص٤٠٢. ابن شداد، م.ن، ج٣، ص٣٢٧. ابن العبري، مختصر الدول، ص١٧٢.

٧- الفارقي، م. س، ص ٤٩

لەگەڵ ئەوەی کە (الفارقي) زیاتر گرینگی داوە بە هەواڵەکانی ئەم میرنشینە، بەڵام زۆربەی زۆری سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە (باد) لە هۆزی حەمیدییەکانە، بۆیە لێرەدا دەکرێت بگوترێت خاربختی یەك لە لقەکانی، یاخود تیرەکانی سەر بە هۆزی حەمیدییە[1].

دەستپێکی ئەو میرنشینە دەگەڕێتەوە بۆ حەفتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی کە لە ناوچەی دیاربەکر[2] سەریهەڵدا[3].دواتر سنووری دەسەڵاتی میرنشینەکە فراوان بوو کە هەموو شارەکانی ئامادەو میافارقین، ئارزان و نصیبین لەخۆ دەگرێت، سەرەڕای ئەمانە شارەکانی خەڵات و ملازگردو ئارجیش وحسن کیفا وبدلیس بگرێتەوە تا باکوری رۆژهەڵاتی دەریاچەی وان لە بەشی رۆژئاوا توانیان دەست بەسەر شاری ئورفە بگرن بۆ ماوەیەك پارێزگاری لێبکەن[4].

(باد) لە ساڵی( ٣٧٣ك/٩٨٣ن) توانی دەست بەسەر موصل[5]دا بگرێت، بەڵام دوا بەدوای تێپەربوونی ساڵێك بوەیهییەکان توانیان موصل لە ژێر دەسەڵاتی ( باد) دەربهێنن و ناچاری بکەن بەپاشەکشەکردن[6] . تالە دوا جار لە ساڵی (٣٨٠کـ/٩٩٠ن)دا بەرەو موصل چوو لە رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ

---

١ - فرست مرعي، م. س،ص٢٣٥

٢ - دیاربەکر، شارێکی فراوانە دەکەوێتە روژئاوای رووباری دیجلە بۆ وڵاتی چیا درێژ دەبێتەوە سەر نصیبین.یاقوت الحموی، م. س، ج٢، ص٤٩٤

٣ - ابن الاثیر، الکامل ،ج٧،ص٤٠٢. محمد امین زکی، الدول و الامارات الکردیة، ص٩٥.

٤ - ابن الاثیر، الکامل، ج٧،ص٤٠٢. توماس بوا، الکرد وکردستان، بحث فی دائرة المعارف الاسلامیة الصادرة فی العام ١٩٨٦م، ترجمة، محمد نجم الدین النقشبندی ،مطبعة المعروف، بغداد ٢٠٠٢م،ص٦٨،استانلی لین بول، طبقان سلاطین الاسلام،ص١١٦

٥ - ابن الاثیر، الکامل،ج٧،ص٤٠٢. ابن العبری، مختصرالدول،ص١٧٢،عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة فی کردستان الوسطی، مطبعة الواء –بغداد ١٩٧٢، ج١، ص٩١

٦- ابن الاثیر، الکامل ،ج٧،ص٤٠٢. ابن العبری، مختصرالدول،ص١٧٢.

حەمدانییەکان( باد) دەکوژرێت[1]، ئینجا کوڕە خوشکەکەی (ابو علي کوڕی مەروان)خێزانەکەی (باد)ی لە خۆی مارە کرد، کە لە حصن کیفا[2] بوو لە شوێن خاڵی دەسەلاتی گرتە دەست، بوو بە جێگرەو وە جێنشینی[3].

سەرئەنجام لەساڵی (٣٨٧ك/٩٩٧ز)دا لە پیلانێکی ناوخۆ کە هەندێ خەڵکی لەگەڵ شێخ (عبدالبر) رێك کەوتن لەسەر کوشتنی (ابو علي) کۆتایان بەژیانی هێنا[4]. دواتر شێخ (عبدالبر) دەستی بەسەر ئامەد داگرت، بەلام ئەو دەست بەسەر داگرتنە زۆری نەخایاند (عبدالبر) لەلایەن (ابن دمنە)ی زاوایەوە کوژرا خۆی دەستی بەسەر ئامەد داگرت[5].لەم ئان وساتەدا (ممهد الدوله ابو منصور کوڕی مەروان) کاتێ گوێ بیستی کوشتنی (ابو علی) برای بوو، بەرەو میافارەقین هات لە ساڵی( ٣٨٧ك/٩٩٧ز)دا فەرمانڕەوایی دەوڵەتی مەروانی گرتە ئەستۆی[6] و بەردەوام بوو لەسەر دەسەلاتی تا ساڵی (٤٠٢ك/١٠١١ز) کە یەکێك لە کۆمەڵ و هاوکارانی خۆی بەناوی (شرەوی)سەرکردەیەکی سەربازی بوو (ممهد الدوله)ی کوشت و خۆی ویستی

---

١ - ابن الوردي، م. س ،ج١، ص٤٦٤ ابو الفداء ، المختصر فی اخبار البشر، ج٢، ص١٣٦

٢ - حصن کیفا، قەلایکی گەورەیە دەکەوێتە سەر رووباری دجلە لەنێوان ئامەد وجەزیرەی بۆتان لە دیاربەکر.یاقوت الحموی، م. س، ج٢، ص٢٦٥

٣ - ابن خلدون،العبر،ج٧،ص٦٧٥،ابن الوردی ،م.س ،ص٤٦٤ –ئارشاك سرفرستیان، کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، وەرگێران،حمە کریم عارف،وەزارەتی روشەنبیری، هەولێر ١٩٩٧، ل٥٢- انور المایی، الاکراد فی بهدینان، الطبعةالثانیة، مطبعة خەبات، دهوك ١٩٩٩، ص١٠٥.

٤- ابن شداد، م. س، ج٣، ص٣٢٨-٣٢٩ . ابن الوردي ،م. س ،ج١،ص٤٦٤. رشید یاسمی، مێژووی نەژادو پەی وەستەگی کورد، وەرگێرانی، کەریم زەند و قانع ،چاپخانەی کامەران، سلێمانی ١٩٦٩ ، ل ١٠٧.

٥ - ابو الفداء، المختصرفی اخبار البشر،ج٢، ص١٢٦-١٢٧. ابن العبري ، مختصرالدول،ص١٧٣. ابن الوردی ،م. س،ج١، ص٤٦٤،

٦ - الفارقي، م.س ،ص٧٩. ابن شداد، م. س، ج٣، ص٣٣٤ ، ،ستانلی لین بول، طبقات سلاطین الاسلام،ص ١١٦. عبد الرقیب یوسف ،الدولة الدستکیة، ج١، ص١٤١

دەسەلاتی هەبوو[١].بەلام (نصر الدولە احمد) برای (ممهد الدولە) توانی دەسەلات بگرێتە دەست[٢] و کاروباری میرنشینی مەروان بەڕێوەببات لەسەردەمی ئەو میرەدا ولاتی مەروانی لە خۆشگوزەرانی دابوو، تا لە سالی (٤٥٣ك/١٠٦١ز)دا دەمرێت و دەسەلاتی دوایی پێ دێت. پاش بەردەوام بوونی پەنجاو یەك سالی لە فەرمانڕەوایی[٣].

دواتر (نظام الدین نصر)ی کوڕی کەناسراو بوو بە (ابو القاسم) دەبێتە جێنشینی[٤]. ئەم میرەش لە فەرمانڕەوایی میرنشینەکە بەردەوام دەبێت تا لە سالی(٤٧٢ك/١٠٧٩ز)دا دەمرێت[٥] (ناصر الدولة ابو المضفر منصور)ی کوڕی شوێنی دەگرێتەوە[٦]، بەلام لە سەردەمی ئەم میرەدا تورکە سەلجوقییەکان بەرەو ولاتی مەروان هاتن، بۆیە هەر بەناو دەسەلاتی لەدەست دا مابوو[٧]. تا لەدواجار لەسالانی (٤٧٨-٤٧٩ك/١٠٨٥-١٠٨٦ز)دا دەبێت بەکۆتایی میرنشینی مەروانی لە ناودەچێت و هەلدەوەشێتەوە[٨]. لەگەل ئەوەی هەندێ لە مێژوونووسان و لێکۆلەرەوان پێیان وایە بە مردنی میر (ناصر الدولە منصور) لە سالی( ٤٨٩ك/١٠٩٦ز)دا کۆتایی بە میرنشینەکە

---

١- ابو الفداء، المختصر في اخبارالبشر، ج٢، ص١٢٧. ابن خلدون ،العبر ،ج٧،ص٦٧٧.

٢ - الفارقي ، م.س، ص٩٣. ابن شداد ، م. س ، ص٣٤١. ابن الوردي ، م. س،ص٤٦٥. ابن خلدون، م. ن، ج٧، ص ٦٧٧.

٣ - الذهبي، دول الاسلام،ج١،ص٣٨٩. ابن تغري بردى، م. س،ج٢،ص٦٩- محمد امين زكي، مشاهر الكرد وكردستان،اعداد رفيق صالح، سلێمانی ٢٠٠٥، ص٦٤.

٤ - ابن تغرى بردى، م. س، ص٦٩. ستانلى لين بول، الدولة الاسلامية، ص٢٤٥.

٥ - الذهبي ، دوله الاسلام،ج١،ص٤٠٦

٦- ابن تغرى بردى، م. س،ص١٠٨

٧- الفارقي، م. س ،ص ٢٠٤. توماس بوا، الكرد وكردستان، ص٦٩

٨- الفارقي، م. ن ،ص ص٢٠٩-٢١٣. ابن الاثير ،الكامل،ج٨،ص٣٠٠. ابن شداد، م. س ،ص٤٠٤. ابن خلدون ،العبر ،ج٧،ص٦٨٥-٦٨٦. فرست مرعى، م س،ص٢٢٦

دێت[1]، بەڵام بۆچوونی یەکەم لە راستییەوە نزیکە لە بەر ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، راستە میر (منصور) لەم ساڵەدا مردووە، بەڵام میرنشینەکە زووتر رووخاوە.

## میرنشینی عەنازی (٣٨١ – ٥١١ك/٩٩١- ١١١٧ز)

میرنشینی عەنازی[2] لەناوچەی حولوان [3]، لە دەوروبەری ساڵی (٣٨١ ك/٩٩١ز)دەرکەوت. کە (ابو الفتح محمد کوڕی عنان) سەرۆکی هۆزی شاذنجانی دامەزرێنەری ئەو میرنشینە بوو، کە بۆ ماوەی بیست ساڵ فەرمانڕەوایی کرد تا لە ساڵی(٤٠١ك/١٠١١ز)دا کۆچی دوایی کرد [4]، دەسەڵاتی ئەم میرنشینە سنوورێکی فراوانی لە ناوچەکانی هەرێمی چیا هەبووە، کە پێکهاتبوو لە حولوان، دەینەوەر، کرمشان، ئەسدئاباد، شهرەزور،صامغان، داقوق، خانیجار،مندلیج(مندلی)، دسکرە چەند ناوچەیەکی تر دەگرێتە خۆ[5]، بە تایبەتی دوای لاواز بوون و نەمانی میرنشینی حەسنەوەیهی کە ناوچەی ژێردەسەڵاتی کەوتۆتە چوارچێوەی سنووری فەرمانڕەوایی عەنازی[6]. دوا

---

١ ستانلی لین بول ،الدولە الاسلامیه ،ص٢٤٥. حسین حوزنی موکریانی، دێرێکی پێشکەوتن ،چاپی دووەمین ،چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢، ل٣٧. محمود یاسین التکریتی ، م ، س،ص١٠٤.

٢- بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ حسام الدین نقشبندی ،الکرد فی الدینور و شهرزور ، ص ص ١٩٥- ٢٥٠. فرست مرعي ،م. س، ص ص ٣٢١-٤٢٢

٣ - محمد امین زکي، الدول و الامارات الکردیة فی العصر الاسلامی ، ص ١٣٦ TH.Bois,Kurds Kurdistan,The Encyclopaedia of islam, Volume, V. Leiden 1986,P 453.

٤- ابن الاثیر، الکامل، ج٧،ص٥٧٤. ابن خلدون، العبر،ج٨، ص١١٠١.

٥ - حسام الدین علي غالب النقشبندي ،الکرد فی الدینور و شهرزور، ص١٩٥- محمد جمیل الروژبیانی ،امارة بنی عیار وحکومتهم فی غرب ایران ، ترجمة محمد الملا عبدالکریم،مجلة المجمع العلمی العراقي –الهیئة الکردیة، المجلد(٥)، العدد (٥)، بغداد ١٩٧٧، ص٤٧٩.

٦ - ابن خلدون، العبر، ج٨، ص١١٠١.

بەدوای (ابو الفتح) کوڕەکەی(حسام الدوله ابو الشوك کوڕی محمد کوڕی عنان) بوو بە جێنشینی لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١١ن)دا سەرکردایەتی میرنشینی عەنازی گرتە ئەستۆ[١]. لەگەڵ بوونی کۆمەڵێك شەڕو کێشەی ناوخۆیی و ململانێی دەرەکی فەرمانڕەوایی ئەم بۆ ماوەی (٣٦) ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی(٤٣٧ك/١٠٤٦ن)دا کۆتایی بە دەسەلاتی دێت[٢].

دوای مردنی (ابو الشوك) دەسەلاتی میرنشینی عەنازی دەکەوێتە دەست براکەی میر(ابو الماجد مهلهل کوڕی ابو الفتح) [٣]تا دواجار ئەم میرە لەلایەن برازاکەی (سُعدی کوڕی ابو الشوك) دەست گیر دەکرێت[٤].سەرەنجام (بدرکوڕی مهلهل) بە یارمەتی سەلجوقییەکان دەبێت بە فەرمانڕەوایی عەنازی[٥]. لەگەڵ ئەوەی ئەم میرنشینە تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆیی لەدەست دابوو کەوتبووە ژێر کاریگەری سەلجوقییەکان، بەلام دەسەلاتیان درێژەی کێشا.

لەدوای مردنی (بدر کوڕی مهلهل) لە ساڵی (٤٦٧ك/١٠٧٤ن)، کوڕەکەی (سرخاب کوڕی بدر)دەبێت بە فەرمانڕەواو[٦] بەردەوام دەبێت لە دەسەلات، تا ساڵی ٥٠٠ك/١١٠٦ن) دەمرێت[٧]. دواجار( ابو منصور کوڕی بدر) جێگای دەگرێتەوە دەبێتە دوا میری ئەم میرنشینە کە بۆ ماوەی ١٣٠ ساڵ بەردەوام بوو[٨]. لە ساڵی (٥١١ك/١١٧ن)دا دەسەلاتی میرنشینی عەنازی کۆتایی هات[٩].

---

١ - ابن الاثیر، الکامل،ج٧،ص٥٧٤. محمد جمیل رۆژبەیانی ،مێژووی حەسەنوەیهی و عەییاری، دار الحریة للطباعة، بغداد ١٩٩٦، ص١٩٩

٢ - ابن الاثیر، الکامل،ج٨، ص٥٤. ابن خلدون، العبر، ج٨،ص١١٠٥.

٣ - ابن خلدون ،العبر ،ج٨،ص١١٠٥. محمد امین زکي ، الدول والامارات الکردیة ،ص١٢٩.

٤ - ابن الاثیر، الکامل،ج٨،ص١٠٨

٥ - م.ن ،ج٨،ص ١١٢.

٦ - فرست فرعي، م. س ،ص٤١٧

٧ - ابن الاثیر، الکامل،ج٨،ص٥٤٧. بدلیسی ،س.پ، ل٤١.

٨- ابن الاثیر، م. ن، ج٨، ص٥٤٧. بدلیسی، هـ.س ،ص٤١. حسین حزنی، اوریکی پاشەوە، ل٣٦. محمد جمیل رۆژبەیانی ،مێژووی حسنەوەیهی و عەییاری، ل٢٣٦

٩- بابا مردوخ روحانی، م. س ،ص١٠٣.

## میرنیشینی هەزبانی (٣٨٧ - ٥٢٢ك/٩٩٧ — ١١٢٨ز)

میرنیشینی هەزبانی[1] لە هەولێرو دەوروبەری دەرکەوت[2] کە هۆزی هەزبانی[3] دامەزرینەری بوون، سەرچاوەکان لەسەر ئەم میرنیشینە زانیاری تێرو تەسەلّ نادەن و

مێژووی دەستپیکی ئەم میرنیشینە زۆر روون نییە لە سالّی چەند و لە لایەن کیٚ ئەم میرنیشینە دامەزراوە، ئەو میرانەی کە فەرمانڕەواییان کردووە یەك لە دوای یەك ماوەی دەسەلاتیان بەروونی باس ناکەن.

لەگەلّ ئەوەی هەندی ئامازەی مێژوویی هەیە کەوا سەرەتای سەرهەلّدانی میرنیشینی هەزەبانی دەگەڕینەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی دەیەمی زاینی کە ئەو کات زۆربەی هەرێمە کوردییەکان بەڕێوەدەبران لە لایەن سەرکردەی میرنشینە ناوچەییەکان و میر (ابو الهیجاء موسك کوڕی چکو) یەکەم میر بووە کە بوونی هەبووە لە رووداوەکانی ئەوکات و پەیوەندی باشی لەگەل عەقیلییەکان[4] هەبوو کە فەرمانڕەوای موصل بوون[5]، بەلاّم سەرچاوە مێژووییەکان لەو ماوەیەدا زانیاری زیاترمان لەسەر هەزبانیەکان لە هەولێر پیٚ نابەخشن تا سالی(٤٣٧ك/١٠٤٥ن) کە (ابن الاثیر)ئامازەی پێدەکات کە لەم

---

١ - بۆزانیاری زیاتر بگەرێوە بۆ، احمد عبدالعزیز،الامارة الهذبانیة الکردیةفی اذربیجان واربیل والجزیرة الفراتیة،موکریانی للطباعةوالنشر، اربیل ٢٠٠٢، ص ٦١- ٦٧

٢- ابن الاثیر،الکامل، ج٨،ص٨١. ابن خلدون ،العبر، ج٧، ص ٥٦٣

٣- هۆزی هەزبانی، هۆزێکی گەورەی کوردن کە لە چەند ناوچەیەکی بەر فراوانی شارەزورو هەولێرو ئازربیجان و هەکاری و دەوروبەری موسل بوونیان هەبووە. احمد عبدالعزیز ، م. س، ص٤١.

٤ - عەقیلیەکان، هۆزێکی عەرەب بوون لە جەزیرەی عەرەبی لەبەر خراپی بارودۆخی سیاسی و ئابوری بەرەو عیراق و جەزیرەی فوراتی هاتن، لاوازی حمدانیەکانیان لەموسل بەهەل زانی توانیان میرنشینی عەقیلی لە سالّی(٣٨٠هـ/٩٩١م)دا دابمەزرێنن. رشید عبدالله الجمیلی، تارخ الدولةالعربیة الاسلامیة، ص١٨٣.

٥- زرار صدیق تۆفیق،القبائل و الزعامات القبلیة الکردیة فی العصر الوسیط،مؤ سسة موکریانی، اربیل ٢٠٠٧،ص١٧٥

ساڵەدا فەرمانڕەوای هەولێر (عیسی کوڕی موسی) هەزەبانی دەکوژرێ[1]. دواتـر براکەی(ابوالحسن سلار کوڕی موسی) دەبێت بە فەرمانڕەوای هەولێر بە یارمەتی (قرواشی کوڕی مقلد)ی عەقیلی کە فـەرمانڕەوای شـاری موصـل بـوو، هاوکـاری (سلار) دەکـات بـۆ گرتنـە دەسـتی دەسـەلآت[2].بـەلآم ئاماژەیـەکی روون نییـە لەسەر چۆنیەتی نەمانی دەسەلآتی، ئەوە نەبێ کە (ابن الاثـیر) و (ابـن خلـدون) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٩ز) دا فەرمانڕەوایی هـەولێر (ابـو الحسن سلار کوڕی موسی)ی هەزەبانی بووە[3]. دوا بەدوای ئەو (ابو علی کـوڕی موسی)ی برای بەیارمەتی ( ابو الحسن عیسکان)ی حەمیدی بۆتە دەسـەلآتداری هەولێر[4].

دواتر فەرمانڕەوایی هەولێر دەکەوێتە دەست (ابو الهیجاء الحسین کـوڕی ابی علي الحسن کوڕی موسك)ی هەزبانی[5]، سەرچـاوەکان زانیاریمـان پێنـادەن لەسەر دەست پێك و سەرەتای

دەسەلاتی ئەو میرە لەگەڵ ئەوەی لەم ماوەیەدا هەرێمە کوردنشینەکان و میرنشینە کوردەکان کەوتبوونە ژێر شەپۆلی هێرشی سەلجوقییەکان، بەلآم لەوە دەچێ پەیوەندی ئەم میرە لەگەڵ سەلجوقییەکان باش بووبێ وەکو(ابن الاثـیر) ئاماژەی پێدەکات لە ساڵی( ٥٠٥ك/١١١١ز)دا سولتانی سەلجوقی نامەی بۆ (ابـو الهیجاء الحسین) فەرمانڕەوای هەولێر ناردووە بۆ ئەوەی بەژداریان لەگەڵ بکـات

---

١ - ابن الاثیر، الکامل ج٨، ص٥٤

٢ - م.ن ،ج٨، ص٥٤-زبیر بلال اسماعیل ،اربیل فی ادوارها التاریخیة ،مطبعـة النعمـان، النجـف ١٩٧١، ص ١٣٣

٣ - ابن الاثیر،الکامل ،ج٨، ص٧١.ابن خلدون،العبر، ج٧،ص٦٣

٤ - ابن الاثیر، الکامل، ج٨، ص٧١-٧٢. ابن المستوفي ، تاریخ اربل المسمی نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل، حققه وعلق علیه، سامی بن السید خماس الصقار، دار الرشید للنـشر، بغداد ١٩٨٠،ج١،ص٣٧٢.

٥ - ابـن المـستوفي، م.ن ،ج١،ص١٠٦. زرار صـدیق توفیـق، القبائـل والزعامـات، ص١٧٧. اللجنـة الاعلامیـة، اربیـل بیـن الماضی و الحاضر،دار الکتب للطباعة و النشر، جامعة الموصـل ١٩٨٦، ص٣١.

بۆ کوشتاری صەلیبیەکان[1]، ئەم میرنشینە بەردەوام دەبێت تا ساڵی (٥٢٢ك/١١٢٨ز) لێرەوە (عماد الدین زنکی) دەست دەگرێت بەسەر هەولێر[2] و کوتایی بەدەوری میرنشینی هەزبانی دێت، لەگەڵ ئەوەی بیروڕای جیاواز هەیە لەبارەی ساڵی کۆتای هاتنی ئەم میرنشینە تەنانەت هەندێ ئاماژە هەیە بۆ ساڵی(٥٣٤ك/١١٣٩ز) دەگەڕێنەوە[3].

---

١ - ابن الاثیر، الكامل ،ج٨، ل٥٨٧

٢ - ابو شامة، الروضتین في اخبار الدولتین النوریة ولصلاحیة. تحقیق، ابراهیم شمس الدین، دار الكتب العالمی، بیروت ٢٠٠٢، ج١، ص١٥٧- عباس العزاوي، اربیل فی مختلف العصور، راجعه، محمد علی القرەداغی ،بغداد ٢٠٠٠، ص٣٢.زبیر بلال اسماعیل، امارة الكردیة الهذبانیة، مجلة كاروان ،العدد (٤٩)، بغداد ١٩٨٦،ص١٣٧.

٣ - احمد عبدالعزیز، م. س.،ص٦٦. قادر محمد حسن، الامارات الكردیة فی العهد البویهي، ص ٤٣

# بەشی دووەم

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی میرنشینەکان

### تەوەرەی یەکەم /هۆکارە ناوخۆییەکان

- ویستی سەربەخۆخوازی
- سیستەمی خێڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردەواری دا
- رۆڵی سەرکردە کوردەکان لە دامەزراندنی میرنشینەکان
- شوێنی جوگرافی وڵاتی کورد و فاکتەری ئابووری

### تەوەرەی دووەم/هۆکارە دەرەکییەکان

- لاوازی خەلافەتی عبباسی
- دیاردەی جیاخوازی
- بوەیهییەکان و کاریگەرییان لەسەر هەرێمە کوردنشینەکان

## تەوەرەی یەکەم/هۆکارە ناوخۆییەکان

### ١- ویستی سەربەخۆ خوازی

ویستی مرۆڤ کاریگەری راستەوخۆی لەسەر کردارەکانیەوە هەیە، بۆیە ویست و کردار پەیوەندییەکی تەواوکاری و بەیەکەوە بەستراوی یەکترن، هەر ئارەزووی مرۆڤە یەکانگیر دەبێت لەگەڵ ئیرادە دێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، بەڵام چەندە ئامانجەکانی خۆیان دەپێکن ئەمە پەیوەستە بە خودی ئەو کەسانە کە بەکردارەکە هەڵدەستن و تاچەند بەرنامەرێژی و پلانیان بۆ دارشتووە بەرەچاوکردنی ئەو بارودۆخ و هەلومەرجەی کە دەوری داون.

لە هەرێمە کوردییەکان لەسەردەمی خەلافەتی عەبباسیدا لە چەند ناوچەیەکی جیاواز نارەزایی بەرامبەر بە دەوڵەت هەبووە، ئەوەتا خەلیفە (ابوجعفر المنصور) لە ساڵی(١٤٨ك/٧٦٥ز) کاتێك پێی راگەیشت کوردەکان لە شاری موصل بڵاوبوونەتەوە نارەزاییان هەیە دژ بە دەوڵەت، بۆیە (خالد کوڕی برمك)ی کرد بە والی ئەم ناوچەیە سەرەنجام توانی راپەڕینی کوردەکان دابمرکێنێتەوە[١].

هەرلە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەم خەلیفەیەدا بۆ جارێکی تر لە ساڵی(١٥٨ك/٧٧٤ز)دا بزووتنەوە سەری هەڵدایەوە لەلایەن کوردەکان لە موصل و جەزیرە، بەڵام بێ ئاکام دەبێت، بۆیە (المنصور) ناچاردەبێت لە مەسەلەی راپەڕینی کوردەکان بکۆڵێتەوە، کە بۆ دووەم جار مەسەلەی یەکلاکردنەوەی کێشەی کورد بە (خالد) ی سیاسەتمەداری دەوڵەت دەسپێرێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نێوەندی خەلافەت هەستیان بە مەترسی نارەزای کورد کردبوو، بۆیە بەم شێوە بە هەندیان هەڵگرت[٢]، بەڵام

---

١ - ابن الاثیر، الکامل، ج٥، ص١٥٦.

٢ - م. ن، ج٥، ص١٩٣. ئارشاك پۆلادیان،کورد لەسەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم ،وەرگێرانی جەلیل کاکەوەیس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٥، ل٦٧.

ئـەم بزاڤــە کوردییــە ســەربەخۆ خــوازو راپەڕینانــەی کــە لــە ناوچــە کوردنشینەکان سەریان هەڵدەدا پێکهاتەیـەکی کەمینـەی هـەبووە، نەبۆتـە ویستێکی سەرتاپەگیری بەرنامەڕێژی بـۆ نـەکراوە، بۆیـە ئامانجـەکانی خـۆی نەپێکاوە بیّ سوود بووە.

سەرەڕای ئەوەش هەندێك جار کوردەکان بەشداریان لەگەڵ ئـەو بزاڤـە بەرهەڵـستی کارانــەی دژ بــە دەوڵــەتی عەبباســی کــردووە، وەك دەبیــنین هاوبەشیان کردووە لەگەڵ بزووتنەوەی بابەکی خـورەمی کـە ژمارەیـەکی زۆر لـە دانیـشتووانی شـارە کوردییـەکان پاڵپـشتیان لێکـردووە، مێـژوو ناسـانی سەدەکانی ناوەڕاست ئاماژەی پێدەکەن وەك (ابن الندیم) دەڵێت (خـورەمی لــە دەوروبــەری چــیاو لــە نێوانیانــدا ئازربیجــان و هەمــەدان و دەینــەور بڵاوبۆنەتەوە)[1] بەهەمان شێوە (ابن العبری) ئاماژەی پێدەکات دەڵێ ((زۆر لــە خــەڵکی چــیا و هەمــەدان و ئەســفەهان و ماســبذان چــوونە نــاو ئــاینی خورەمی))[2].

بـە گـوێرەی ئـەو زانیاریانـەی کـە سەرچـاوەکان باسـی لێوەدەکـەن ژمارەیەکی زۆر خـەڵك لـە هـەرێمی چیاکاندا کـە زۆربـەی دانیـشتووانەکەی کورد بوون باوەڕیان بە خورەمی هێناوە، وەك (بندلی جوزی) دەڵێ ((کورد پۆل پۆل چوونە ناو ئاینی بابك))[3] لەم روانگەیەوە دەکرێت بڵێین هۆکـارو پاڵنەری بەشداری هەندێك کورد لەم بزووتنەوەیـە نـەك خـودی بیروبـاوەڕی خـورەمی بوبێـت بـەڵکو تــەنها ویـستی جیابوونـەوە بـووە لـە دەوڵـەتی عەبباسی.

سەبارەت بە هاوبەشی کردنی کـورد لـەڕووی کرداریـەوە لـە شـەڕەکان دەردەکەوێتکە ( عصمة)ی کوردی ئـەمیری مرنـد[4] بەشـداری کـردوە لەگـەڵ

---

١ - الفهرست، ص٤٩٣

٢ - تاریخ مختصر الدول، ص١٣٩

٣ - من تاریخ الحرکات الفکریه فی الاسلام، ص٨٣.

٤ - مرند، یەکێکە لەشارە بەناوبانگە کانی ئازربیجان، یاقوت الحموی، م. س، ج٥، ص١١٠

(بابك) هاوەل و هاوكاری بووە، وەكو (اليعقوبي) دەڵێت ((عـصمة) كـوردی خاوەنی مرند گوێڕایەڵی بابك بوو))[1]. بەڵام سەرچاوەكان هیچ زانیارییەكیان لەسەر ئەم میرە كوردە نەداوە نازانرێت چۆن و كەی بۆتە خاوەنی ئەم شارە.

پاشان (عصمة) لەلایەن سوپای عەبباسییەكانەوە دەستگیر كراوە خرایە زیندانەوە، خەلیفە (المعتصم) سوودی لێدەبینێ لە بارەی رێوشوێنی بابك و شێوازی زاڵ بوون بەسەریدا سەرەنجام ناوبراو تا سەردەمی خەلیفە (الواثق) (٢٢٧-٢٣٢ك/٨٤٢-٨٤٧ز) هەر لە زینداندا مایەوە[2].

لەو ماوەیەدا بزووتنەوەیەك بەڕابەرایەتی (موسى الكوردي) لە جەزیرەی بۆتان سەریهەڵدا لە ساڵی(٢٢٦ك/٨٤١ز)دا كەتێدا ژمارەیەكی زۆر كورد كوژرا[3]. لەگەڵ ئەوەی كە ویستەكانی كورد بەڕوونی دەردەكەوێ لەو راپەڕینانە بۆ سەربەخۆیی جیابوونەوە لە دەسەڵاتی مەركەزی، بەڵام كارەكانیان بەرنامەرێژی بۆ نەكرابوو، هیچیان پەیوەندیان بەیەكتریەوە نەبوو، بەیەكەوە دەستیان پێنەكرد، لەبەرئەوە نەیان توانیوە ئامانجەكانی خۆیان بەدیبهێنن.

بە هەمان شێوە ڕووداوێكی تر كەناڕەزایی كورد دەردەخات بەرامبەر دەسەڵات لە ساڵی(٢٣١ك/٨٤٦ز)دا روویدا لەدەوروبەری فارس و ئەسفەهان و (بلاد الجبل- ولاتی شاخاوی) كە سەركردە (وصیف)ی توركی ئەركی سەركوتكردنەوەی گرتبووە ئەستۆ دوای دامركانەوەیان پێنج سەد كەسێكی دەستگیركردو لەگەڵ خۆی هێنا، لەبەرامبەردا خەلیفە پارە یەكی زۆری پێدا[4].

دیارە سەركوت كردن و لەناوبردنی راپەڕینەكان و دەستگیركردنی سەركردەكانیان نەبۆتە هۆی لەناوبردنی بیرۆكەی جیابوونەوەو سەربەخۆیی،

---

١ - تاريخ اليعقوبي ،ج٢،ص٣٢٢.

٢ - الطبري، م. س، ج٥، ص٢٢٤. ابن الاثير، الكامل، ج٦، ص١٢.

٣- زرار صديق توفيق، الكرد فی العصر العباسي حتى مجی البويهيين، ص ١٣٦

٤ - الطبري، م. س، ج٥، ص٣١٥. ابن الاثير ،الكامل ،ج٦،ص١٠٠. احمد الخليل، تاريخ الكرد فی الحضارة الاسلامية، دارهيرو، بيروت ٢٠٠٧م، ص١٧٦.

بۆیە دەبینین لەنیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچی تایی سییەکانی سەدەی نۆیەمی زایینی راپەرینێکی گەورەی کورد لەموصل بەڕابەرایەتی(جعفرکوڕی فهرجس) بەرپابوو [1] لەگەڵ ئەوەی بیروڕای جیاواز هەیە لەسەرناوی باوکی، وەك (الازدي)بە (جعفر کوڕی مرخوش)ناوی دەبات[2]،(المسعودي) بە(جعفرکوڕی فهرجیش) ناوزەندی دەکات[3]، بەڵام گومانی تێدانییە کەسەرکردەی ئەم بزووتنەوە راپەڕیوە ناوی (جعفر)ە و کوردیش بووە.

خەڵکێکی زۆر لە کورد شوێنی کەوتن جگە لەوانەی کە ڕق ئەستوور بوون بەرامبەر عەبباسییەکان، کە مەترسیەکی زۆر لەسەر دەسەڵات دروستکرد،لەبەر ئەوە خەلیفە (المعتصم) فەرمانی بە (عبدالله کوڕی السید کوڕی انس)دا بۆ شەڕکردن و بەرهەڵستی کردنی ئەم بزووتنەوەیە[4]. بۆیە (جعفر) و لایەنگرانی بەرەو چیای داسن چوون توانیان بەسەر سوپای عەبباسیدا سەربکەون و (عبدالله) کوژرا،و (اسحاق کوڕی أنس)ی مامیشی دەستگیر کرا[5].

بەم شێوە بزووتنەوەکە پەرەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینی، وەکو (المسعودي) دەڵێت ((دەستیان بەسەر ئەو ناوچانە داگرت کە دەکەوێتە نێوان موصل و ئازربیجان و ئەرمینیا))[6] ئەمەش مانای وایە کەوا گەشەکردن و فراوانی بەخۆیەوە بینیوە کە مەترسی زۆری لەسەر دەسەڵاتی مەرکەزی هەبووە.

---

١- ابن الاثير، م.ن، ج٦، ص٥٩.

٢- تاريخ الموصل،ص٢٣١.

٣- التنبيه والاشراف، ص٣٢٤.

٤- ابن الاثير، الكامل، ج٦، ص٥٩.

٥ – الازدي، م.س، ص٥٣١.

٦ – المسعودي، التنبيه والاشراف، ص٣٢٤ فاروق عمر فوزى،الخلافة العباسية،ص٢٦٤.

بۆیه خەلیفه (المعتصم) سەرکردەی تورك (ایتاخ) لەگەڵ سوپایەك بەرەو موصـل نـارد بـۆ بـەرەنگار بوونـەوەیان[1] سـەرئەنجام (جعفـر) كـوردی لەساڵی(٢٢٦ك/٨٤٠ن)دا كوژرا[2] و كۆتایی بە بزووتنەوەكە هات

لەڕاستیدا چەندە گەندەڵی و لاوازی دەوڵەتی عەبباسـیدا زیـاتر دەبـوو ئەوەندە ئارەزووی جیابوونەوەی لە دەوڵەت زیادی دەكرد وەك لە زیادبوونی بزووتنەوە بەرهەڵستی كارەكـان بـەدی دەكرێـت لـە سـاڵی (٢٨١ك/٨٩٤ن)دا خەلیفە (المعتـضد) بـەرەو موصـل چـوو بـۆ لـەناوبردنی مەترسـی كـورد كـە بـەهاوكاری عەرەبـەكان دژ بەخەلافـەت وەسـتابوون، بـەڵام سـەركەوتوو نەبوون[3].

هەرلەم كاتەدا (المعتضد) رووی كردە قەڵایەك لە ناوچەی (الحسنية)[4] بە مەبەستی لەناوبردنی سەركردەیەكی كورد بـەناوی(شـداد) كـە سـوپایەكی زۆری هەبوو دەڵـێن ژمارەیـان دەگەیـشتە دەهـەزار پیـاو، بـەڵام (المعتـضد) توانی بەسەریان زاڵبێت و قەڵاكەش بروخێنێت[5].

ئەوەی جێگـەی سـەرنجە زۆربـەی بزووتنـەوە كوردییـەكان لـە شـاری موصل و دەوروبەری سـەریانهەڵدا ئەوەتـە دەبیـنین لەسـاڵی(٢٩٣ك/٩٠٥ن)دا كوردە هەزبانییەكان بەسـەركردایەتی (محمـد كـوڕی بـلال) كـە مـیری هـۆزی هەزبانی بوو، هێرشیان كردە سـەر موصـل دەسـتكەوتێكی زۆریـان لـە رووی

---

١ - ابـن الاثـیر، الكامـل، ج٦، ص٥٩. محمـد امـین زەكـي، خولاصـەیەكی تـاریخی كـوردو كوردستان،ئامادەكردنی رەفیق سالح-بەرگی چوارەم، بنكەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦، ل٩٨

٢ - ابوحنيفة الدينوري، م. س، ص٤٠٢-ابـن الفقـه، مختـصركتاب البلـدان، ص٥٣- ابـن الاثـير، الكامل، ج٦، ص٦٠-البكجرى الحنفى، م. س، ص١٢٢ –محمد امين زكى، خلاصه، ص٩٨.

٣- الطبري، م.س، ج٥، ص٦٧١-٦٧٢. ابن الاثير، الكامل، ج٦، ص٤٨٠.

٤- الحـسنية، ناوچـەیەكەلەنێوان رۆژهـەلاتی شـاری موسـل و جـەزیرەی بوتـان، ئێـستا بـە ناوی(زاخو) بەناوبانگە. ياقوت الحموي، م. س، ج٢، ص٢٦٠.

٥- الطبري، م. س، ج٥، ص٦٧٢. ابن الاثير، الكامل، ج٦، ص٤٨٠.

مادیەوە بەدەست هێنا [1] (ابوالهیجاء عبدالله کوڕی حمدان) کە فەرمانڕەوای حەمدانییەکان بوو لە موصل لەگەڵ سوپایەك رووبەڕووی هەزبانیەکان وەستا لەسەر رووباری(خازر)[2] بەیەکگەیشتن کەتێدا حەمدانییەکان شکستیان خوارد[3] بۆیە ناوبراو داوای یارمەتیان لە خەلیفە(المکتفی)کرد بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات تاوەکو بتوانن بەسەر هەزبانییەکان زاڵبن لەکاتی گەیشتنی یارمەتی خەلیفە لەساڵی(٢٩٤ك/٩٠٦ز)دا (محمد کوڕی بلال) هاوشانی پێنج هەزار بنەماڵەی هەزبانی بەرەو شارەزوور کەوتەڕێ بەشێکیان روویان کردە ئازربیجان[4] بەشەکەی تریان لەگەڵ(محمد کوڕی بلال) گەڕانەوە زێدو جێگاو رێگای خۆیان پاش ئاشت بوونەوە لەگەڵ حەمدانییەکان[5].

لەکۆتاییەکانی خەلافەتی(المکتفی) لە ساڵی(٢٩٥ك/٩٠٧ز) بزووتنەوەیەکی گەورەی کورد لە ئەسفەهان سەریهەڵدا کە نزیکەی دە هەزار کورد بەژدارییان تێداکرد دژ بە دەوڵەتی عەبباسی پاش ناردنی هێزێك بۆ بەرهەڵستی کردنیان و سەرکوتکردنەوەیان ناچاریانکردن بەگەڕانەوەیان بۆ گوێڕایەڵی خەلافەت[6].

بۆجارێکی تریش کوردەکان لە موصل ناڕەزایان دەربڕی و سەرپێچی دەوڵەتیان کرد لەساڵی(٣٠٩ك/٩٢١ز) بۆ ئەم مەبەستە خەلیفە (المقتدر)

---

١ - ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٥٤٧. ابن خلدون، العبر، ج٦، ص٧٤٨.

٢- خازر، رووبارێکە دەکەوێتە نێوان هەولێرو موسل. یاقوت الحموي، م. س، ج٢، ص٣٣٧.

٣ - ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٥٤٧. زبیر بلال اسماعیل، اربیل فی أدوار ها التاریخیة، ص١٣١.

٤ - ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٥٤٧. ابن خلدون، العبر، ج٥٦، ص٧٤٩. زبیر بلال اسماعیل ، اربیل ، ص١٣١

٥- ابن الاثیر، م.ن ،ج٦،ص٥٤٧. احمد عبدالعزیز ،م. س ،ص٦١-٦٢.

٦ - الطبري، م. س، ج٥، ص٧٣٦- ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٥٦٦. مؤلف مجهول، العیون العدائق، ج٤-ق١، ص٢٠٢.

فەرمانی بە (محمد کوڕی نصر)دا بۆ لێدانی کوردە مارانیەکان[1]. کە ژمارەیەکی لێ کوشتن و هەشتا کەسیشی بەدیل گرت و ناردی بۆ بەغدا[2].

بەوردبوونەوە لەم دەقە مێژووییانە بۆمان دەردەکەوێت لە پێکهاتەی کەسایەتی تاکی کورد ئارەزوو و ویستی جیابوونەوەی هەبووە و هەوڵیشیانداوە بۆ دامەزراندنی قەوارەی سەربەخۆ، بەلام لە سنوورێکی جوگرافی بەرتەسك بووە، نەیان توانیوە بە ئیرادەیەکی یەکگرتووی بزووتنەوەیەکی گشتگیری بهێنە ئاراوە، بەڵکو ئەو راپەڕینانەی کە بەرپایانکردووە دەرئەجامی کاردانەوەی چەند کردارێك بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ویستە لای کورد بۆتە بناغەیەك کە دواتر میرنشینی سەربەخۆی لەسەر دامەزراوە.

## ٢- سیستەمی خێڵایەتی لە کۆمەڵگەی کوردیدا

سروشتی خێڵ[3] لەبنەڕەتدا شێوازی پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردییە لە کۆنەوە، ئەم سروشتەش نەك هەر لە کۆچەرەکان، بەڵکو نیشتەنییەکانیش دەگرێتەوە و رەگی بەقووڵی لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی دا کوتاوە[4]. خێڵ تاکە پەناگایەکی ئەمین و دڵنیاکەر بووە، هەم بۆ تاکەکانی سەر بەم

١- مارانیەکان، تیرەیەك بوون لەهۆزی هەزبانی. ابن خلکان،م. س ،ج٣،ص٢٤٣.

٢ - ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٦٧٣- ٦٧٤. احمد الخلیل، م. س، ص١٧٧.

٣- خێڵ، سیستەمێکە لە رێکخستنی کۆمەلایەتی چەند کۆمەڵێك یاخود تیرەیەك دەگرێتەخۆ لە نێوانیاندا زمان و کەلتوری هاوبەش هەیە، لەگەڵ بوونی هەستێکی بەهێز بۆ هاوکاری و خزمایەتی، هەمیشە خێڵ لە هەرێمێکی دیاریکراو نیشتەجێن. محمد عاطف غیث، قاموس علم الأجتماع، دار المعرفة الجامعیة، الاسکندریة ١٩٧٩، ص٤٩٠.

٤ - م.س. لازاریف، چەند کێشەیەکی دیموگرافی و مێژووی و سیاسی پەیوەندی کۆمەلایەتی و ئابوری، وەرگێڕان کاوێس قەفتان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد، ب١٦-١٧، بەغدا ١٩٨٧، ل٢٩٢ مینۆرسکی، کورد، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی مارف خەزنەدار، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، هەولێر ١٩٨٤، ل٧٢.

خێڵه، هەم بۆ خێزانیش ئاسایشی مرۆڤی کورد لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، وابەستەی بڕی ئەو داکۆکی لێکردن و پاراستنە بووه کە خێڵ بۆی دابین کردوون، پەناگەی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی مرۆڤی کورد ئەو هێزە بووه کە خێڵ هەم لە واقیعدا و هەم لەفیکری ئەودا دروستیکردووە.

بۆیە پێکهاتەی سیستەمی کۆمەڵگەی کوردی لەبنچینەدا بنیادنراوە لەسەر ئینتیماو دەمارگیری و پەیوەست بوون بە خێڵ و هۆزەوە[1]، لە کاتێکدا (ابن خلدون) مەرجی دروستبوونی دەوڵەتی بەدەمارگیرییەوە بەستۆتەوە[2]. بەو پێیەی کە میرنشین یەکەیەکی بچووککراوەی دەوڵەتە دەبێت تاکەکانی خێڵێك دەمارگیرییان بۆ بنەچەو خێڵایەتی بۆ ئەو خاك و نیشتیمانە هەبێت کە تێیدا نیشتەجێ بووینە بۆ ئەوەی بتوانن پارێزگاری لێبکەن.

بۆیە دەبینین خێڵ و میرنشین لە کوردستاندا لە هەلومەرجی پارچە پارچەی هەمیشەیی وڵاتی کوردانـدا، وەکو شێوەیەکی ئاڵۆزی تەرکیبی سیاسی، خۆیان نواندووە لە مێژووی هەر میرنشینێکی کوردیدا خێڵێك بەرچاو دەکەوێت کە پشتگیری لە دامەزراندنی کردووە[3].

لە ڕاستیدا هەر میرنشینێك بگرین لەسەدەکانی ناوەڕاست لەکۆمەڵگای کوردیدا هەر لەیەکەم میرنشینەوە هەتا دوا میرنشین خێڵێکی دیار ئەو میرنشینەی دامەزراندووە، هەوڵیداوە خێڵ و عەشیرەتەکانی تریش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بێگومان هەرێمە کوردییەکان چەندین هۆزو خێڵ و تیرەی لە خۆگرتووە[4]، بەڵام هەندێکیان توانیویانە میرنشین دابمەزرێنن.

---

١- ولیم ایکلیتون، العشائر الکردیة، ترجمة، حسین أحمد الجاف، دار ناراس للطباعة والنشر، اربیل ٢٠٠٧، ص١٩.

٢- مقدمة ابن خلدون، الطبعة التاسعة، دار الکتب العلمیة، بیروت، ٢٠٠٦، ص١٢٤.

٣- ی نی فاسیلیه ڤا، کوردستانی خوارو رۆژهەلات لەسەدەی حەفدەوە تا سەدەی نۆزدە، وەرگێڕان رەشاد میران، چاپخانەی وەزارەتی رۆشەنبیری، هەولێر ١٩٧٧، ل٢٠٦.

٤ - بۆ زانیاری زیاتر لەسەر خێڵە کوردییەکان لەسەدەکانی ناوەراست بگەرێوە بۆ : زرار صدیق توفیق،القبائل والزعامات القبلة الکردیة فی العصر الوسیط، ص١٨-ص١٩٤.

(ابن خلدون) ئەوەمان بۆ روونده‌کاتـەوه کـه تاکـه خێڵێـك هەرچـەنده پەرت و بڵاوی تێدابێت هەردەبێ خـاوەنی دەمارگیریـەك بێـت کـه لەگشتیان بەهێزتر بێت، بەسەر هەموو خێڵەکانی تر زاڵبێت، و باڵیان بەسەر دابکێشێ و بیانخاتــه ژێــر ڕکێفــی خــۆی[1]. لەســەردەمی خەلافــەتی عەبباســیدا خێڵــی حەمیدی[2]، هەزبانی، شاذ نجانی و بە رزیکانی کوردی[3] توانیویانه ئەم رۆڵە بگێــڕن میرنــشین دابمــەزرێنن و بــوون بــه دامەزراوەیــەکی ئیــداری سیاســی و ئابووری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی.

بەڵام ئەوەی له خێڵی کوردیدا بـەدی دەکرێـت، پەیوەسـت بوونـه بـه زەوی[4]، بۆیه دەبینین لەسەردەمی خەلافەی عەبباسیدا هۆزه کوردییەکان له چـەند سـنوورێکی سـنووردار توانیویانــه میرنــشین دروسـت بکـەن، وەك لــه ناوچەکانی ئازربیجان و هەرێمی رۆژئاوای چیا[5]،ناوچەکانی جەزیرەی بۆتـان و دیاربەکر[6].

هەروەها له هەرێمی ئاران[7] و هەولێر و دەوروبـەری[8] بێگومـان خێڵـه کوردییەکانی ئەم هەرێمانه وەك بنیادی پێکهاتەی خۆیان خاوەن هێز بووینـه و بەکاریان هێناوه بۆ دامەزراندنی میرنـشین لـه چـوار چێوەی ئـەو سـنووره

---

١- المقـدمـة، ص١٣١. فوئـاد علـی، کۆمەڵناسـی نـوێ ابـن خلـدون، ومرگێـران، زیـرەك احمـد، چاپخانەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٦، ص٩١-٩٢.

٢ - الروذراوري، م. س، ج٦، ص٥٣. ابن العبري، مختصرالدول، ص١٧٢.

٣ - ابـن حوقـل، صورة الارض، الطبعـة الثالثـة، منـشورات دار مكتبـة الحيـاة، بـيروت ١٩٧٩، ص١٩٥. ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٣٧٠. ابن خلدون، العبر، ج٨،ص١١٠١

٤ - توماس بوا، تاريخ الاكراد، ترجمة، محمد تيسير ميرخان، دار الفكر، دمشق - سوريا ٢٠٠١، ص٤٨.

٥ - مينورسـكى، تـاريخ قفقـاز، ص٢٤٠- زامبـاور، م. س، ج٢، ص٢٧٢- احمـد كـسروى، م. س، ص١٦٧. حسام الدين علي غالب النقشبندي، الكرد فى الدينور وشهرزور، ص٣.

٦ - ابن خلدون، العبر، ج٧، ص٦٨٥- شرفخانى بدليسى، س. پ، ل٢٩.

٧ - محمد امين زكي، الدول و الامارات الكرديه، ص٩٠. احمد كسروى ، م. س ،ص٢٦٦.

٨ - ابن خلدون، العبر، ج٧، ص٥٦٣- زوبير بلال اسماعيل، اربيل ادورها التاريخية ، ص١٣٣ .

جوگرافیایـەی کەتێـدا نیـشتەجێ بوونـە و بـەردەوامیان بەخۆیاندایـە بـۆ سەردەمێکی کاتی.

ئەمەش لەگەڵ بیروڕاکانی (ابن خلدون) یەکدەگرێتەوە کە دەوڵـەت لای ئەو سنووردارە، چ لەسەر ئاستی شوێن و چ لەسەر ئاستی کات[(١)].

لەڕاسـتیدا سـەرکردەی خێڵـە کوردییـەکان ممارەسـەی جۆرێـك لـە دەسەڵاتیان دەکرد لـە چوارچێوەی سـنووری خێڵایـەتی بـەر لەدامەزرانـدنی میرنشین، کاتێك بـارو دۆخـی هەرێمایـەتی گونجـاو بـوو، بۆشـایی دەسـەڵاتی سیاسی لەناوچەکانی ئەوان هاتە ئاراوە، بۆیە ئـەوە دەرفـەتێك بـوو توانیـان دەسەڵاتی خێڵایەتیان پەرە پێبدەن و فراوانی بکەن لە سـنووری دەسـەڵاتی خێڵەوە بیگۆڕن و بیکەن بەدەسەڵاتی میرنشین.

دیـارە دەسـەڵاتی سیاسـی لـە ناوچـە کوردنـشینەکان لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا خـۆی لـە میرنـشین دەبینێتـەوە و فـۆرمێکی خێڵایـەتی لـەخۆ گرتبوو، وەکو باسمان کرد خێڵە کوردییـەکان وەك یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی و سیاسی بە گشتی بە مەڵبەندەوە بەستراونەتەوە، ئەگەر بـاس لـە پەیوەنـدی نێـوان ئـەم خێڵانـە بـە حـوکمڕانی مەڵبەنـدەوە بکـەین،[(٢)] دەبینـین سـیمای دەسەڵاتدارییەکی وابەستەی ناڕاستەوخۆ لە هەرێمە کەنار کەوتووەکان زاڵە.

کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاست هەتاکو ئێستاکەش هەرێمێکی کەنار کـەوتووی ئـەو دەوڵەتانـەبووە، کـە پێیانـەوە بەسـراوەتەوە، بۆیـە گۆڕانکارییـەکانی ئـەوێ لەسـەر کوردسـتان بـێ ئـەنجام نـەبووە[(٣)]. لاوازی و

---

١- المقدمة، ص١٣٤-١٣٥. ئەلبیرت عیسا، عصبیەت وتیـوری دەوڵەت لـە بـیری ابـن خلـدون دا، چاپخانەی روون، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٠٩.

٢- حوکمی مەڵبەند ،مەبەستمان لە دەولەتی عەبباسی یە کە خێلە کوردییـەکان وابەسـتەی ئەم دەسەلاتە بوون.

٣- مارتین ڤان برونەسن ،ئاغاو شێخ و دەولەت ،وەرگێرانی لە ئەلمانیەوە بۆ کوردی، کوردۆ، بەرگی یەکەم ،چاپی چوارەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلیمانی ٢٠٠٣، ل ٢٠٧-٢٠٨.

سستی دەوڵەتی عەبباسی ئاکامەکەی دەرکەوتنی میرنشین بووە، لە ناوچە کوردییەکان، وەکو هەرێمێکی کەنارکەوتوو وابەستەی بە دەسەڵاتی مەڵبەندیەوە سوود وەرگرتن لە گۆڕانکارییەکانی دەوروبەر بەشێك بووە لە هۆشیاری خێڵی کورد توانیویەتی بە ئاراستەی بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێ بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ.

بۆ روونکردنەوەی ئەم پرۆسەیە پەنا دەبەینە بەر هەندێك لە خێڵە کوردییەکان کە لەسەردەمی خەلافەتی عەبباسیدا توانیان چەند میرنشینێکی کوردی دابمەزرێنن کە کاریگەرییان هەبوو لەسەر رەوتی سیاسی رووداوەکانی هاوچەرخی خۆیان.

دەبینین لەساڵی (٣٤٠ك/٩٥١ن)دا (محمد کوڕی شداد)ی کوردی، بەسوود وەرگرتن لە هەستی دەمارگیری کوردەکان لە ناوچەی ئاران، بەهاوکاری خێڵەکەی توانی پەرە بەدەسەڵاتی بدات و میرنشینی شەدادی دابمەزرێنێت[1]، هەروەها کوردە رەوادییەکان لە هەرێمی ئازربیجان کە تیرەیەك بوون لە هۆزی هەزبانی[2] توانیان میرنشینی رەوادی دابمەزرێنن[3].

بەهەمان شێوە لەساڵی (٣٨١ك/٩٩١ن) خێڵی شاژنجانی بناغەی فەرمانڕەوایی میرنشینی عەنازی لە شاری حولوان بنیاتنا کە زۆربەی رۆژئاوای هەرێمی چیای گرتەوە[4].

یەکێك لەو فاکتەرە بەهێزانەی کە (ابن خلدون) بە بەردی بناغەی دەوڵەتی دادەنێت ژیانی کۆچەرییە هەردەبێ دەوڵەت بەو قۆناغەدا تێپەڕێت[5]. ئەوەش لەگەڵ خێڵە کوردییەکان یەکانگیرە، ئەوەتا

---

1- Minorsky, studies ,p8.9

٢ - ابن خلكان، م. س، ج٥، ص٤٩٥

٣ - احمد كسروى ، م. س،ص١٦٨. حسن حزنی، کوردستانی موکریانی، ل٢٣٩. حسام الدين النقشبندى، اذربيجان ،ص١٣٢.

٤- ابن خلدون ، العبر ،ج٨،ص١٠١.

٥ - المقدمة، ص١٠٢.

حەسنەوەیهییەکان خێڵی بەرزکانی خاوەن مەڕومالاَت بوون،[1] توانیان لە شارەزوور رۆژئاوای هەرێمی چیا بناغەی میرنشینی حەسنەوەیهی دابمەزرێنن[2]، هەروەها (باد کوڕی دوستك) لەسەرەتادا شوانی مەڕومالاَت بوو،[3] توانی میرنشینی دۆستەکی – مروانی بە هاوکاری و پشتیووانی خێڵی حەمیدی لە هەرێمی جەزیرەی بۆتان دابمەزرێنێت[4].

بەهەمان شێوە هەزبانییەکان لەژیانێکی کۆچەری دەژیان و خەریکی بەخێوکردنی مەڕومالاَت بوون،[5] توانیان لە بنیاتنان و پێکهێنانی میرنشینی هەزبانی لە هەولێرو دەوروبەری سەربکەون[6]. ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەبوو کە ژیان و گوزەرانیان سەخت و ناگزووره ناخۆش بوو، هەوار و شوێنەکانیان لەبارنەبوو، ئەمەش وایکردبوو ئازایی و دەمارگیری و پشتگیری لایان بەهێزبیت [7] ئەوە لەخێڵە کوردییەکان بەدی دەکرێت کەیەکێك لەخەسڵەتەکانیان ئازایی و چاونە ترسی و بوێریە و پیاوی شەڕبووینە[8]، ئەوەش خۆی لەخویدا پێگەیەکی بەهێزە بۆ بنیاتنانی دەسەلاَت، بەو شێوەیە دروستبوونی دەسەلاَتی سیاسی لە کوردستان لەسەردەمی عەبباسییەکاندا کە خۆی لە میرنشین دەبینیەوە لەسەر بنەمای خێلاَیەتی

---

١- الروذراوري، م. س، ج٦، ص١٧٣.حيدرلشكرى، الكرد فى المعرفة التاريخية الاسلامية، دار سبيريز، دهۆك ٢٠٠٤، ص٢٤٤

٢ - بدليسى، س. پ، ل٢٣-٢٤. فرست مرعي، م. س، ص١٣.

٣ - ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٤٠٣. TH. Bois,Kurd,The Ency of Islam,Vol.V.P452

٤ - ستانلى لين بول، الدول الاسلامية، ص٢٤٤.

٥ - زرارصديق توفيق، القبائل والزعامات ،ص١٧٣.

٦ - ابن الاثير ،الكامل ،ج٨،ص٥٤. ابن خلدون ،العبر، ج٧،ص٥٦٢.

٧ - ابن خلدون، مقدمة، ص٩٩-١٠٠. محسن محمد حسين ، نظرية الدورات المتعاقبة عند ابن خلدون وفيكو، (المجلة العربيه للعلوم الانسانية)جامعة الكويت-كلية الاداب، العدد(٩)، المجلد(٥)، صيف، ١٩٨٥، ص١٣٢-١٣٣

٨- العمرى، مسالك الأبصار فى ممالك الأمصار، السفر الثالث (مخطوط) نسخة المجمع االعلمى العراقي، ص ١٧٠.

دروست بووه، که خێڵ وەکو یەکەیەکی کۆچەری و کایەکی کۆمەڵایەتی و بوونی هێزێکی سەربازی توانیویەتی دەسەڵاتێکی سیاسی لەناوچەیەکی جوگرافی تایبەت بە خۆی دروست بکات.

## ٣ - رۆڵی سەرکردە کوردەکان لە دامەزراندنی میرنشینەکان.

بیرو بۆچوونی جیا هەیە لەسەر دیاری کردنی رۆڵی[١] سەرکردە یاخود پاڵەوان لە مێژوودا دەکرێت سیاسی بێت، یاخود سەربازی، یا چاکسازی کارێکی کۆمەڵایەتی بێت، یا تاکێك بێت، جیا بکرێتەوە بەزیرەکی و بەتوانایی کە کۆمەڵێك خەسڵەتی تێدا کۆدەبێتەوە جیای دەکاتەوە لەکەسانی تر[٢]. بێگومان رۆڵی تاکەکان بەپێی شوێن و کاتەوە جیاوازیان لە نێواندا هەیە، دەرکەوتنی سەرکرە وەك پێویستییەکی مێژوویی رۆڵی خۆی دەبینێ لە ئاراستەکردنی رووداوە مێژووییەکانی سەردەمی خۆی.

ئەمە پەیوەستە بە چۆنیەتی بەکارهێنانی زیرەکی و ئیرادەی سەرکردە لە رووبەڕوو بوونەوەی بارودۆخی ناوخۆ و دەرەکی و کێشە بابەتی و خۆییەکاندا، ئەمەش سەرکەوتنی عەقڵ و ژیرییە لەسەر ئاراستەکردنی رووداوەکان[٣].

دەبینین ئاراستەی جیاواز هەیە لەرووی پێکهاتەی نێوان تاکەکانی خێڵێکدا، دەکرێت کەسێك توانایەك یاخود هێزێکی دیاری کراوی هەبێت لە پێکهاتە گشتییەکانی مرۆڤ، بەڵام سەرکردە توانایەکی جیای هەیە، لە رووی

---

١ - (رۆڵ) ئامازەیە بۆ نواندنی کۆمەڵێك چالاکی و سیفاتی کەسی، هەروەها تۆخمێکی کارلێکی کۆمەڵایەتی کەتێیدا تاك هەندێك رەفتارو کردار دووبارە دەکاتەوە لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتی وسیاسییەکاندا. محمد عاطف غیاث، م. س، ص٣٩٠

٢- هاشم یحیی الملاح و اخرون، دراسات فی فلسفة التاریخ، غانم الحفو، نظریات تفسیرالتاریخ، دار الکتب للطباعة والنشر، الموصل ١٩٨٨، ص١١٨.

٣- بلیخانوف، دورالفرد فی التاریخ، ترجمة، احسان سرکیس ،دار دمشق للطباعة والنشر، دمشق ١٩٧٤،ص٥٧.

عـەقڵ و هێـزەوە لەبەرامبـەر عەقڵیەتـەکانی تـردا[1]. هـەر ئەوەیـە دەبێـت بەبنەماو پێکهاتەی بنیادی سەرکردەو سەرکردایەتی کردنی.

لەکاتێکدا تەنگژەیـەك لـە بـواری کۆمەڵایـەتی، یـاخود سیاسـیدا دروسـت دەبێت، دەبێتە هۆی پێویست بوونی دەرکەوتنی سەرکردە بۆ چارەسەر کردنی و یەکلایی کردنەوەو بەلاداخستنی خێرایی ئەم کێشەیە، هەر ئـەوەش فاکتـەری گرنگیدان بەکەسایەتی سەرکردەو پاڵەوان[2].

دیـارە لـە مێـژووی دەسـتپێکی میرنـشینە کوردییـەکانی سـەردەمی عەبباسـی ئـەوە بـەڕوونی بەرچـاو دەکـەوێت سـەرهەڵدانی تەنگـژەو ناسەقامگیری هەرێم و ناوچە کورد نشینەکان کاریگەری هەبووە لەسەر میرو سەرۆك خێڵەکان کەوا رۆڵی خۆیان بگێڕن. توانیان

دەسەڵاتێکی تایبەت بەخۆیان بنیاد بنێن. لەگەڵ ئەوەی کـە جیـاوازی هەیە لە نێوان فەیلەسوف و مێژوونوسان لەسەر ئەوەی کە سەرکردە یاخود پاڵەوان پیاوی رووداوە لە مێژوودا، یا دروستکاری رووداوە لە مێژوودا[3]، کـە ئەمەش بیرو بۆچوونی جیا هەڵدەگرێت.

بەڵام (هیگڵ) لە رێگای لێکدانەوە و بایەخ و گرنگیدان بەڕۆڵی تاکەکان لە جووڵانەوە مێژووییەکاندا، ئەوەمان بـۆ روون دەکاتـەوە و دەڵێـت: مرۆڤـە مەزنـەکان یـاخود سـەرکردەکان نـە ئاراسـتەی ئاقـاری مێـژوویی دەکـەن و نەتوانای ئەوەشیان هەیە کە ئاراستەکەی بگۆڕن، بـەڵکو هـەموو ئەوشـتانەی کە ئەوان دەیکەن ئەوەیە کە بەڕووی پێویـستی سـەردەمەکەیانەوە دەچـن و خۆیان لەتەك زەرورەت یا پێویستی مێژووییدا دەسازێنن هەر ئەوەش نهێنـی

---

١- برتراندراسل، السلطة والفرد، ترجمة، محمد بكر خليل ،مطبعـة لجنـة التـاليف والترجمـة والنشر، القاهرة ١٩٥٣، ص٣٥.

٢- سدنى هوك، البطل فى التاريخ، ترجمة، مروان الجابرى، المؤسسة الاهلية للطباعة والنشر، بيروت ١٩٥٩،ص٣٢-٣٤

٣- سيدنى هول، م. ن ،ص٦٥٥- بليخانوف، دور الفـرد ،ص٤٢ - هاشـم يحيـى المـلاح واخـرون ، دراسات فى فلسفة التاريخ، غانم الحفو، نظريات تفسير التاريخ، ،ص١١٨-١١٩.

مەزنی ئەوانە[1]. ئەم بیرو رایەی (هیگڵ) لەگەڵ میرە کوردەکان، وەکو پێکهێنەرو بنیاتنەری میرنشینەکان و ئەوبارو دۆخەی کە ناوچە کوردییەکان بەخۆیانەوە بینی یەکانگیرە.

دەبینین لە هەرێمی ئازربیجان و ئاراندا بۆشایی دەسەڵاتی سیاسی دروست دەبێت بەهۆی دەستگیرکردنی (السالار مرزبان) لەساڵی (٣٣٧ك/٩٤٨ز) لەلایەن بوەیهییەکانەوە[2]. بەوە بوار بۆ (محمد کوڕی الحسین)ی ڕەوادی دەرەخسێ وەك کەسایەتییەکی لێهاتوو ڕووبەڕووی پێویستی سەردەمەکەیەوە دەچێت و دەست دەگرێت بەسەر ئازربیجان و میرنشینی رەوادی دادەمەزرێنێ[3].

بەهەمان شێوە هەر دەستگیرکردنی (السالار مرزبان) دەبێتە فاکتەرێکی سەرەکی و پاڵنەرێکی بەهێز بۆ (محمد کوڕی شداد) لێهاتووی خۆی دەردەخات، سوود لەبارو دۆخی هەرێمی ئاران وەردەگرێت، هەڵدەستێت بەبنیادنانی میرنشینی شەدادی[4]. دیارە سوود وەرگرتن لە هەلومەرج و ناسەقامگیری بارودۆخی هەرێمایەتی ئەمەش لێهاتوویی خۆی دەوێت کە ئەو میرانە توانیان ئەمە دەربخەن کە بەکارامەییەوە کاردانەوەیان ئەنجامدا سەرئەنجام بوون بەبنیادنەری دەسەڵاتی سیاسی لە هەرێمەکانیان توانیان خۆیان لەگەڵ زەرورەتی مێژووییدا بگونجێنن.

لەڕاستیدا ڕۆڵی تاکەکەس بەدرێژایی قۆناغەکانی ژیان دەگۆڕێت، چونکە ڕۆڵگەلێکی نوێ بۆرۆڵە کۆنەکان زیاد دەبێت و لەهەندێ کاتدا هەندێ لە ڕۆڵەکان جێگۆڕکێ دەکەن[5].

---

١- زکریا ابراهیم ،میتۆدی دیالیکتی فەلسەفەی مێژوو و سیاسەت لای هیگل ، وەرگێرانی، سامان علی حامید ،دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٦، ل٦٩.

٢- مسکویه، م. س، ج٥، ص٢٩١-٢٩٢. ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص١٨٣-١٨٤.

٣ - مینۆرسکی، تاریخ ققفاز یا، ص٢٤. حسام الدین علي غالب النقشبندي، اذربیجان ،ص١٣٣.

٤ - محمد امین زکي، الدول والامارات الکردیة، ص٩٠-٩١.

٥- پەروین سازگار، ئاوردانەوەك لە کۆمەلناسی، وەرگیرانی، جەواد مستافا، هەولێر ٢٠٠٢، ل١٢٥.

دەبینین (باد کوڕی دوستك) لەسەرەتا شوان بووە[1]، بەڵام ڕۆڵەکەی دەگۆڕێت دەبێت بەدامەزرێنەری میرنشینی دۆستەکی– مەروانی[2]. بێگومان ئەمە بێ بنچینە نەبوو، وەکو (توماس کارلیل) دەڵێ ((هێزو و پیاوەتی ئازایی جۆرێك لە فۆرمی پاڵەوان بە مرۆڤ دەبەخشێ))[3] (باد)ی کوردیش هەڵگری ئەم خەسڵەتانەبووە لە ئازایەتی و بوێری و نەبەردیدا[4] سەرئەنجام توانی ببێت بە بنیادنەر.

هەروەها کەسایەتی (أبو علی کوڕی مروان) دوای کوژرانی (باد) بەزیرەکی و بەتوانایی و لێهاتوویی خۆی توانی پارێزگاری لەو دەسەڵات و بناغەیە بکات کە بنیادنرابوو، هەموو ئەو شارو قەڵاو هەرێمە بخاتەوە چوار چێوەی دەسەڵاتی خۆی[5]. و ڕووبەڕووی حەمدانییەکان وەستا توانی پارێزگاری لە سنووری فەرمانڕەوایی میرنشینی مەروانی بکات[6]. بێگومان هەبوونی ئەم دوو سەرکردەیە وەك دوو کەسایەتی کارا و لێهاتوو هۆکارێك بوو بۆ دامەزراندن و سەرهەڵدانی میرنشینی مەروانی.

بەهەمان شێوە (حسنویە کوڕی الحسین)ی کوردی کەسایەتییەکی سیاسی و رابردوێکی باش و پیاوێکی دەست بڵاوو خاوەن بەزەیی و بەخشندەو خێرۆمەند بوو[7]. بێگومان ئەم خەسڵەتانەی کاریگەری هەبوو

---

١- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٤٠٣. The Ency of Islam.Vol.V.P452 TH.Bois,Kurds,

٢- الفارقي ، م. س ،ص٥٠ -٥١ . فرست مرعي، م. س، ص٢٥٢.

٣- الابطال ،ترجمه محمد السباعي ،دار الكاتب العربى ،بيروت (د ت) ،ص١٩٧.

٤ - الروذراوري، م. س ،ج٣،ص٥٣ - محمود ياسين التكريتى ، م. س ،ص٦١. انورالمايى، م. س، ص١٠٥

٥ - الفارقي، م. س، ص٦٠ - ابن العبري، مختصر الدول، ص١٧٣. ابو الفداء، المختصر، ص١٣٦. ابن الوردي، م. س، ص٤٦٤

٦- الروذراوري، م. س، ج٦، ص١٠٩. ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٤٣٥.

٧- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٣٧١. بدليسى، س. پ، ل٢٤.

لەسەر کەسایەتی (حسنویە) بۆتە هۆی بەدەست هێنـان و پاڵپشتی کردنـی هۆزەکەی بۆی کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکە.

لەبەر ئەوەی هاونیشتمانی و سـەرکردەی لێهاتوو بەیەکـەوە دەتـوانن دروستکاری رووداوی مێژوویین و ئامانجەکانی خۆیان بپێکن، لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانی پەیوەندی نێوان خەڵك و سـەرکردە دەبێتـە پەیوەندیـەکی بابـەتی، بناغـەو بنەچـەیەکی سـەرەکی بـۆ دەسـەڵاتێکی سـەرکەوتوو سەرکردەیەکی ناودار[1].

سەرەڕای ئەوەی (حسنویە) بە هۆی زیرەکی و بەتوانایی تـوانی ببێتـە میراتگری دەسـەڵاتی عەیشانییەکان و جێگـای میرەکانیـان بـەناوی(ونـداد و غانم) بگرێتەوە دوای مردنیـان و قـەڵاو پێگـەی دەسـەڵاتیان لێوەربگرێـت[2]. بەکارامەیی توانی میرنشینی حسنویە دابمەزرێن.

لەڕاسـتیدا سـەرکردەی لێهـاتوو بـەتوانا هۆکـارێکی کاریگـەرە بـۆ دامەزراندنی قەوارەی سەربەخۆ، بێگومان دەسەڵاتی کوردیش لە سـەدەکانی ناوەڕاست لەمە بەدەر نەبووە، لە دەسپێکی هەر میرنشینێك میرێك بە سـوود وەرگرتن لە هەلومەرجی ناوچەیی توانیویەتی ڕۆڵی خۆی بگێڕێت.

دەبینین پێش دامەزراندنی میرنشینی عەنازی لەسـاڵی (٣٣٩ك/٩٥٠ن)دا، (ابن ابی الـشوك) کـوردی شـاذنجانی کەسـایەتییەکی لێهـاتوو بـەهێزبوو، بۆیـە (معـز الدولـە)ی بـوەیهی داوای یارمـەتی لێـدەکات بـۆ ئـەوەی بەرهەڵـستی هەڵگەڕانەوەی تورکەکان بکات لە هەمەدان، سـەرئەنجام تـوانی بەسـەریان زاڵ بێت[3]. بەوە پێگەی (ابن ابی الشوك) لای بوەیهییەکان بە هێز دەبێت.

کردارێکی تر (ابن ابی الشوك) لە سـاڵی (٣٤٢ك/٩٥٣ن) ئەنجامیدا،کـەوا بە هێـزی و بـوێری و ئازایـەتی نـاوبراو دەردەخـات، کاتێـك خـەلیفـە هەوڵیـدا

---

١ – بليخانوف، دور الفرد فی التاریخ، ص٤٠-٤١.

٢- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٣٧٠-٣٧١. حسام الـدين النقـشبندي، الكـرد فـی الدينوروشـهرزور، ص١٣١. فرست مرعي، م. س، ص١٣٥.

٣- ابن الاثير، م.ن، ج٧، ص١٩١.

ئاشتی بخاتە نێوان سامانی و بوەیهییەکان نێردراوێکی نارد بۆ خوراسان لە گەڕانەوەیاندا کە گەیشتن بە حەلوان (ابن ابی الشوك) لەگەڵ کوردەکان نێردراوەکانی دەستگیر کرد[1]. بە (معز الدولە)ی ڕاگەیاند بەو مەرجە دەستگیراوەکان بەردەدات کە ئەویش ئەو بارمتانەی لای خۆی ئازاد بکات (معز الدولە) بەڵێن و متمانەی پێدا، ئینجا (ابن ابی الشوك) دەستگیراوەکانی ئازاد کرد[2].

بەم ئاماژە مێژووییانە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو میرە خاوەن دەسەڵات و هێز بووە، لە ناوچەی حولوان و دەکرێ بڵێین هەر ئەومیرە ڕێگە خۆشکرێکە بۆ (ابو الفتح کوڕی عنان) کە یەکێك بوو، لەو سەرکردانەی کە توانیویەتی ڕۆڵێکی کارا بگێڕێ لە گۆڕینی سەرکردایەتی کردنی سەرکردەی خێڵ بۆ سەرکردەی میرنشین، (ابو الفتح) سەرەتا دەستی کرد بەفراوان کردنی پێگەی دەسەڵات و کۆنترول کردنی چەند شار و ناوچەیەك، توانی ببێت بە دامەزرێنەری میرنشینی عەنازی[3].

بەهەمان شێوە دامەزراندنی میرنشینی هەزبانی لە هەولێرو دەوروبەری بە هەوڵ و کۆششی میر (أبو الهجاء موسك بن چكو) بوو کە توانی پەیوەندییەکانی ڕێك بخات لەگەڵ عەقیلییەکان لە شاری موصل[4]. دیارە ڕێکخستنی پەیوەندی دۆستایەتی پێویستی بەسەرکردەی کارامەیە بۆ ئەوەی بتوانی سنووری دەسەڵاتی خۆی بپارێزێ وە هێزی بەرامبەر نەبێتە مەترسی و هەڕەشە بەسەر میرنشینەکەی.

---

١ - مسکویە، م. س، ج٥، ص٢١٢. ابن الاثیر، م. ن، ج٧، ص٢٠٦.

٢ - مسکویە، م. ن، ج٥، ص٢١٣- محمد جمیل رۆژبەیانی، مێژووی حەسنەوەیهی و عەییاری، ص١٨٥.

٣ - بدلیسی، س. پ، ل٣٨. محمد امین زكي، الدول والامارات الكردیة، ص١٢٦ حسام الدین النقشبندي، الكرد فی الدینور وشهرزور، ص١٩٨ - فرست مرعي، م. س، ص٣٤٤.

٤ - مینورسکی، تاریخ قفقاز، ص١٩٧ - زرار صدیق توفیق ،القبائل والزعامات،ص١٧٥.

## ٤- شوێنی جوگرافی وڵاتی کورد و فاکتەری ئابووری

هەڵکەوتی شوێنی جوگرافیا کاریگەری زۆری هەیە لە ئاراستەکردنی رووداوە مێژووییەکان تا ئەو ڕادەی کە هەندێك لە بیرمەندان جوگرافیا بە رووپۆشی مێژوویی دادەنێن. یاخود بەشێوازێکی تر بڵێین جوگرافیا ئەو پێگەیە کە بۆتە شانۆی رووداوە مێژووییەکان کە پەیوەندییەکی تەواوکاری و یەکانگیریان بەیەکەوەیە، بۆیە ناکرێت ئەو پەیوەندی و تەواوکارییە کارلێکردن و کاردانەوەیان بەسەر یەکەوە نەبێت.

سروشتی پێکهاتەی وڵاتی کورد و ئەو ناوچەی کە میرنشینی کوردی لەسەر بنیادنراوە لە شەهرەزورەوە بۆ ئامەد لە نێوان سنووری ئازربیجان و جەزیرە و دەوروبەری موصل جیادەکرێتەوە بە دیاردەی هەڵکەوتەو پێکهاتەی چیای سەخت و دژوار[1] تاگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە کوردو چیا بەیەکەوە دەناسرێن، هەندێك لە توێژەران و جوگرافیا ناسان رایانگەیاندووە کە کاریگەری دیاردەی جوگرافیا بەتایبەتی چیاو رووبارەکان بەتەواوی دەرکەوتووە لەسەر رێکخستنی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا جیاوازەکان[2].

سروشت و هەلومەرجی شاخاوی کوردستان کاریگەر بووە لەسەر دەرکەوتنی سیستەمی سیاسی کە خۆی لە میرنشین دەبینێتەوە، ئەوەش بەهۆی سەختی ناوچەکەو دەستبەسەر داگرتن و مانەوە تێیدا ئەوەندە ئاسان نییە، دەبینین لە رۆژئاوای هەرێمی چیا کە پێگەی دەسەڵاتی حەسنەوەیهییەکان و دیاربکر و جەزیرە بنکەی میرنشینی مەروانی بوو، سەرەڕای ئەوەی بوەیهییەکان هەوڵیانداوە بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان،

---

١- ابن حوقل، م. س، ص٣١٥ – الحميري، الروض المعطار فى خبر الأقطار، حققه، إحسان عباس، الطبعة الثانية، مكتبة لبنان، بيروت ١٩٨٤، ص ٤٤٧.

٢- هاشم يحيى الملاح و اخرون، دراسات فى فلسفة التاريخ، غانم الحفو، نظريات تفسيرالتاريخ، ص١٠٥.

بەلام نەیانتوانیوە سەرکەوتووبن[1]، هەر لەو بارەیەوە (بدلیسی) دەڵێت ((ئەگەر جاروباریش وا هەڵکەوتبێ پادشایەك لەو پادشا زلانە هەولیدابێت کوردستان بخاتە ژێر چەنگی خۆیەوە، زۆری خوێن و ماڵ لیّ بەخت کردووە و زۆر بەگرانی لەسەر کەوتووە))[2]. لەلایەکی ترەوە سروشتی شاخاوی ئاو و هەوایەکی سارد بەرهەم دێنێ کە کۆمەڵێك خەسڵەتی تایبەتی بە دانیشتووانەکەی دەبەخشێ کە بریتییە لە بەهێزی و چالاکی و ئازایی[3]، ئەوەش لە تاکی کوردیدا بەدی دەکرێت بەهۆی رەنگدانەوەی پێکهاتەی سروشتی چیایی بەسەریەوە کە تایبەتمەندی لە ئازایی و بەهێزی جەستەیی پێبەخشیوە، کە بەردەوام لە ململانێ بووینە لەگەڵ حکومەتی ناوەند[4].

هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا هەڵکەوتی شوێنی جوگرافیای هەندێك لەو ناوچە کوردنشینانە کە میرنشینەکان تێیدا سەریانهەڵدا، تارادەیەك دووربوون لە دەسەلاتی مەرکەزی و پێگەیەکی سنوورییان هەبوو، بەرامبەر بەو هێزانە کە لە دەوروبەری دەسەلاتی عەبباسیدا گوزەریان دەکرد و زۆر جار دەبوون بەمایەی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەر دەوڵەت، کە بەهۆی لاوازییەوە ئەو توانایەی نەبوو پارێزگاری تەواو بکات لە ناوچە سنوورییەکان ئەوە هەلی دەرکەوتن و سەرکەوتنی بۆ ئەو هێزە کوردیانە رەخساند کە کەوتبوونە ئەو ناوچانەوە، دەبینین کوردەکانی دیاربەکر و جەزیرە توانیان سوود لە پێگەی جوگرافیان ببینن بەرگری لە ناوچەکانی خۆیان بکەن (باد کوڕی دوستك) رۆڵێکی کاریگەری گێڕا لە رووبەڕووبوونەوە و غەزاکردن و بەرهەڵستی کردنی بیزنتییەکان، پاراستنی

---

١ - الرذراوري، م. س، ج٦، ص٥٤ ابن الجوزي، م. س، ج١٤، ص٢٢٢. ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٤٠٢.

٢- البدليسي، س. پ ، ص ٢٧.

٣- ابن خلدون، مقدمة، ص٦٨، هاشم يحيى الملاح، دراسات فى فلسفة التاريخ، ص٩٩- ١٠١.

٤ - عباس فاضل السعدي، اساسيات الجغرافية البشرية، مؤسسة الوراق، عمان - الأردن ٢٠٠٢، ص٢٤٢.

سـنوورەكەی لەمەترسـییە دەرەكییـەكان[1] كـە ئـەم ناوچـانە بـەردەوام پێویـستییان بـەبوونی هێزێـك هـەبوو، بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی هەڕەشـە دەرەكییەكان كە دەسەڵاتی مەركەزی ئەو توانایەی نەبوو بە ئـەركی خـۆی هەڵستێ ئەوەش بواری لە بەردەم دەسەڵاتی كوردی خۆشكرد تا دەسەڵاتی خۆیان بسەلمێنن و بیسەپێنن.

بەهـەمان شـێوە هەرێمـەكانی ئازربیجـان مەڵبەنـدی فـەرمانڕەوایی رەوادی و ئـاران، مەركـەزی شـەدادی ناوچـەیەكی سـنووری و فـۆڕمێكی تووخوبیان وەرگرتبوو بەرامبەر بەڕوسـەكان و ئەرمەنـەكان كـە هەڕەشـەو مەترسیان دروست دەكرد بۆ سەر دەوڵـەتی ئیـسلامی، ئـەوەتا رووسـەكان لە ساڵی(٣٣٢ك/٩٤٣ز) هێرشیان هێنایە سەر ئاران[2]، بۆیە هـەبوونی هێـز لەو ناوچانەدا پێویستییەكی مێژوویی بوو بۆ بەربەست كردن و بەرهەڵستی كردنی هێرشە دەرەكییەكان، كە كوردەكان توانیان بە شێوەیەكی كرداری بەم كارە هەڵستن كاتێـك لـە سـاڵی (٣٤٢ك/٩٥٣ز) ئەرمەنـەكان هێرشـیان هێنایە سەر ئەردەبیل،(محمد كـوڕی شـەداد) تـوانی بـەرەنگاریان بێتـەوە شكـستیان پێبهێنــێ[3]، هــەروەها (محمــد كــوڕی رواد) پارێزگــاری لــە ئازربیجان كرد و سوپای بـەڕووی ئەرمەنـەكان ئاراسـتە كـرد[4]، بێگومـان پێگەی جوگرافیای ئەم هەرێمانە رۆڵی خۆیان بینیـوە لـە نەشـونماكردنی دەسەڵاتی كوردی لەم ناوچانەدا.

سەرهەڵدانی میرنشینی عەنازی لە حولـوان كـە ناوچـەیەكی سـتراتیژی گـرنگ بـوو، مەركـەزی دەسـەڵاتی عەبباسـی لـە بەغـداد بـە هەرێمـەكانی

---

١ - الـروذراوري، م. س، ج٦، ص٥٣. أبـن الأثـير، الكامـل، ج٧، ص٤٠٢. ابـن شـداد، م. س، ج٣، ص٣٢٧.

٢- مـسكويه، م. س ، ج ٥، ص٢٦٥- ٢٦٦. ابـن الأثـير، م.ن، ج٧، ص١٢٨ — ١٢٩. كـسروی، م. س، ص٨٠ — ٩١.

٣- اسماعيل شكر رسول، م. س، ص٨٣ — ٨٤.

٤- احمدكسروی، م. س، ص١٦٨ — ١٧٢.حسام الدين النقشبندي، اذربيجان، ص١٣٥.

ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەبەستاوە[1]. کە کوردە شاذنجانییەکان بە پارێزەری ئەم ڕێگە دانرابوون[2].ئەوەش لە بەرژەوەندی ئەوان گەڕایەوە و توانیان سوود لەو ناوچەیە وەربگرن بیکەن بە بناغەی میرنشینێکی کوردی.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوە بڵێین ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ژمارەیەکی زۆر لە قەڵاو شوورەی بەرزی لەخۆ دەگرێت، وەکو هێڵێکی بەرگری و پەناگەیەك بەکار دەهاتن لەلایەن کوردەکان لە بەرامبەر شاڵاوی سوپاو لەشکری هێزەکانی دەوروبەر، هەر لەو بارەیەوە گەڕۆکی تورك ئەولیا چەلەبی دەڵێت ((لە کوردستاندا حەوسەد و حەفتا قەڵا هەیە کە هەموویان ئاوەدانن))[3] دروست کردنی زۆربەی ئەو قەڵاو شوورانە پەیوەست بووینە بە بارودۆخی سیاسی، بەڵام ئامانجی سەرەکی لە بنیادنانیان بۆ بەرگری کردن لەشوێن و ناوچەکانیان بووە، وەك دەزگایەکی سەربازی بەکار دەهاتن بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئاسایش بۆ دانیشتووان و ناوچەکانی دەوروبەری، سەرەڕای ئەوەی مەرکەزێکی ئیداریش بوو[4]، بۆیە دەبینین دەستپێکی زۆربەی میرنشینەکان لە قەڵاوە دەستی پێکردووە، وەکو مۆڵگەو بنکەی خۆیان سوودیان لێ وەرگرتووە.

ئەوەتا هەزبانییەکان توانیان قەڵای هەولێر بەکاربهێنن بیکەن بە مەڵبەندی میرنشینی هەزبانی[5]، حەسنەویهییەکان بۆ دامەزراندن و پارێزگاری کردن لە میرنشینەکەیان سوودیان لە قەڵای (سرماج) وەرگرت و

---

١- ابن خرداذبه، م. س، ص٤٦. قدامةبن جعفر، الخراج وصناعة الكتابة، تحقيق، محمد مخزوم، دار احياء التراث العربي، بيروت ١٩٨٨، ص٦٣. الاسكندري، م. س، ص١٧٠. فرست مرعي، م. س، ص٢٣٧.

٢- مسكويه، م. س، ج٥، ص٣١٣. مؤلف مجهول، العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص٤٧٢.

٣- ساحە تنامەی ئەولیا چەلەبی، وەرگێرانی سعید ناکام، چاپی دووەم، هەولێر ١٩٨٧، ل٩١

٤- فوزية يونس فتاح و فرهاد حاجي عبوش، وسائل تحصين المدينة الكوردية من القرن ( ٤-٧هـ - ١٠-١٣م)، مجلة جامعة دهوك، المجلد(٦) العدد(٢)، دهوك ٢٠٠٢، ص٤٩-٥٠.

٥- ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٨١ — ابن خلدون، العبر، جـ٧، ص٥٦٣.

لەوێوە گەشەیان بە دەسەڵاتەکەیاندا[١]، کەقەلایەکی گەورەو بەهێزبوو، لە ناوچەیەکی چیایی سەختدا[٢]. هەروەها هەرێمی دیاربەکر زۆری چیای سەخت قەڵای پتەوی لەخۆ گریبوو، هەروەك (الأنصاری) دەڵێت: ((حصن کیفا لەسەرسورهێنەرترین قەڵاکانی جیهانە))[٣] کە مەروانیەکان لە وێوە فەرمانڕەوایەکەیان فراوانی بەخۆیەوە بینی و پەرەی سەند[٤].

بێگومان هەبوونی ئەم قەڵایانە، وەك پێگەیەکی جوگرافی کاریگەری خۆیان نواندووە لەسەر هەڵدان و گەشەسەندنی دەسەڵات لە کوردستان، ئەگەر لەڕوانگەیەکی ترەوە سەیری بکەین سروشتی جوگرافیاو کەشوهەوای ناوچە کوردنشینەکان کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر گەشەی ئابووری کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بنەمایەکی بە هێزو فاکتەرێکی بنچینەییە بۆ دروست کردن و دامەزراندنی دەسەڵات و دەوڵەت.

بۆیە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە رێکخستنی سیستەمی سیاسی و فکری پێش هەموو شتێك لەسەر بنەمای بارودۆخی ئابووری و ماددی دیاری دەکرێت لە کۆمەڵگادا کە ئەم رێکخستنەش رەنگ دانەوەی سروشتی چالاکی مرۆڤە لەبەرهەمهێنان و پەیوەندییە ماددییەکاندا[٥]، سەرئەنجام

---

١- ابن الأثیر، م.ن، جـ٧، ص٣٧١ — حسام الدین النقشبندي، مدن و قلاع قدیمة مندرسة فی أقلیمین شهرزور و لورستان الشمالیة (الصغری)، مجلة هزارمیرد، العدد (٢١)، سلیمانی ٢٠٠٢، ص ١٨٥.

٢- مسعر بن مهلهل، الرسالة الثانیة، أعتنی بنشرها، مینورسکی، مطبعة جامعة القاهرة، القاهرة ١٩٥٥، ص ١٥.

٣- نخبة الدهر فی عجائب البر والبحر، مطبعة لایبزیك ١٩٢٣، اعادت طبعة بالأوفیست مکتبة المثنی بغداد، ص١٩٢.

٤- الفارقي، م. س، ص٦٠. ابن العبري، ختصر الدول، ص١٧٣. ابو الفداء، مختصر فی اخبار البشر، جـ٢، ص١٣٦ — ابن الوردي، م. س، جـ١، ص٤٦٤.

٥- عاصم الدسوقي، البحث فی التاریخ، دار الجیل، بیروت ١٩٩١، ص١٤٧-١٤٨-هاشم یحیی الملاح، المفصل فی فلسفة التاریخ، دارالکتب العلمیة، بیروت ٢٠٠٧، ص٣٤٠.

شیکردنەوەی سەرهەڵدان و دامەزراندی دەوڵەت و دەسەلات و میرنشین بە ئاراستەیەکی دووربین بەکاریگەری و کارتێکردنی راستەوخۆیی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانە لە کرداری بەرهەمی کۆمەڵایەتیدا[1].

دەبینین وڵاتی کورد و ئەو هەرێمانەی میرنشینەکانی تێدا دەرکەوتووە خاوەنی داهات و سەروەرت و سامانێکی زۆربوون هەر وەك مێژوونووس و جوگرافی ناسان ئاماژەی پێدەکەن، ئەوەتا ناوچەکانی ئاران و ئازربیجان[2] لەڕووی بەرهەمە جۆربەجۆرەکانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و بەزۆری خێرو خێرات بەناوبانگن بە تایبەتی شاری بردعە کە کەوتۆتە نزیك رووبار و زەویەکی بەپیت و بەرهەمهێن خاوەنی داهات و بەروبوومێکی جۆراو جۆرە[3] سەرجەم شارەکانی مرند، مراغە، خوی، سلماس، تبریز کە ئابووریەکی بە هێزیان پێکهێناوە باغ و باغاتێکی زۆریان لە خۆگرتووە[4]، کە کاریگەری لەسەر ڕەوتی ژیان هەبووە.

بەهەمان شێوە رۆژئاوای هەرێمی چیا وڵاتێکی پڕ داهات و بەروبوومێکی گشتگیرە[5] هەروەکو جوگرافیناسان ئاماژەی پێ دەکەن

---

١- بليخانوف، العامل الاقتصادي فى التاريخ، ترجمة، جورج طرابيشيى، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت ١٩٧٨، ص٩٣-٩٤.

٢- بۆ زانیاری زیاتر لەسەر داهاتی ئابووری ئەم ناوچانە بڕوانە، کوثر اسماعيل حسين الحياة الإقتصادية و إلاجتماعية فى اقليمي أذربيجان وآران خلال القرنين الرابع و الخامس الهجريين/ العاشر و العادى عشر الميلاديين، رسالة ماجستير جامعة صلاح الدين، كلية الاداب، اربيل ٢٠٠٢ ص٤٠ – ١١٠.

٣- ابن حوقل، م. س، ص٢٩٠. المقدسي، احسن التقاسيم فى معرفة الأقاليم، تحقيق، محمد مخزوم، دار احياء التراث العربى، بيروت ١٩٨٧، ص٢٨٨. ابو الفدا، تقويم البلدان، اعتنى بتصحيحه و طبعه، رينود و ماك كوكين ديسلان، دار الطباعة السلطانية، باريس ١٨٤٠، ص٤٠٢.

٤- ابن حوقل، م.ن، ص٢٨٩. ابو الفدا، تقويم البلدان، ص٢٨٨.

٥- بۆ زانیاری لە سەر ئابووری ئەم هەرێمە بڕوانە، نيشتمان بشير محمد، الأحوال السياسى والأجتماعية و الأقتصادية غربي أقليم الجبال خلال القرنين الرابع و الخامس الهجريين – العاشر والحادى عشر الميلاديين، ص – ١١٨ – ١٦٣.

شارێكی وەكو حولوان و هەمەدان لەرووی بەرووبووم و بەرهەمی میوەجاتەوە زۆر بەناوبانگ بوونە [1].

هەروەها هەرێمی جەزیرە هاوشێوەی ناوچەكانی تر خاوەن داهات و بەرهەمێكی فرە جۆر[2] بووە بە شێوەكی گشتی ناوچە كوردنشینەكان دەوڵەمەندن بە بەرووبوومی كشتوكاڵ و داهاتی میوە و بەرهەمی ئاژەڵی كە ئابوورییەكی گرنگ و ستراتیژی بۆ ناوچەكان دابین دەكات.

بێگومان هەبوونی ئەم بەرهەم و بەرووبوومەی كەلە شارە جیاجیاكانی وڵاتی كوردو ناوچە كوردنشینەكان كاریگەری راستەوخۆی لەسەر ژێرخانی هەرێمەكانەوە هەیە، ئەمەش پاڵپشتیەكی گەورەیە بۆ دامەزراندنی قەوارەیەكی سیاسی سەربەخۆ و بنیادنانی دەسەڵات، لەبەر ئەوە پێكهاتەی میرنشین رەنگدانەوەی سروشتی خۆیەتی، لەرووی سەربازییەوە سوپایەكی تایبەتی لەخۆ گرتووە بۆ پارێزگاری كردن لە سنووری هەرێمایەتی كە پێویستی بە ڕەهەندی ئابوورییە ئەمەش لەناوچە كوردنشینەكان فەراهەم بووە.

ئەگەر تێڕوانینێكی گشتگیریمان هەبێت بۆ ئابووری و سەروەت و سامانی هەرێمە كوردنشینەكان پێش سەرهەڵدانی میرنشینەكان، دەبینین بە شێكی زۆری ئەم داهاتە بۆ حكومەتی مەركەزی دەگەڕایەوە، ئەوەتا حەمدانییەكان ساڵانە برێكی زۆر پارەو ماڵ و دارایی دەڤەری جەزیرەی بۆتانیان دەنارد بۆ عەبباسیەكان[3] بەهەمان شێوە(یوسف بن ابی الساج) كە والی بوو لەسەر ئازربیجان و ئاران، هەموو ساڵێك دووسەد و بیست هەزار دیناری كۆدەكردەوە و دەینارد بۆ خەلافەتی بەغدا [4]، هەروەها لەسەردەمی خەلیفە (المقتدر)لە ساڵی(٣١٧ك/٩٢٩ز)لە ناوچەی شارەزور (هارون كوڕی

---

١- المقدسي، م. س ، ص٢٩٥- ٢٩٦. مسعر بن مهلهل، م. س، ص١٢-١٣. القزويني، م. س، ص ٣٥٧.

٢- ابن حوقل، م. س، ص١٩٠.

٣- ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٨٧ -٧٩. ابن تغري بردى، م. س، ج٣، ص٢٦٤.

٤- مسكويه، م. س، ج٥، ص١١.

غریب) دوای دەست بەسەر داگرتنەوەی ئەم شارە، داوای خراجی بیست ساڵی کرد، سەرئەنجام لەسەر بیست و حەوت هەزار دینار سەد هەزار درهەم رێککەوتن[1]. دیارە لەو ماوەیەدا کوردەکانی ئەو ناوچەیە باج و خراجیان بە مەرکەز نەداوە.

گومانی تیدانییە بردنی ئەو ماڵ سامانە لەناوچە کوردنشینەکان ویستی جیابوونەوەی دروستکردووە کاریگەری هەبووە، لەسەر سەرهەڵدانی بیرۆکەی سەربەخۆیی بەتایبەتی لای خێڵە کوردییەکان کە خاوەنی هێزێکی سنووردار بووینە لە سنوورەکەی خۆیاندا کە فاکتەری ئابووری بۆتە پاڵنەرێکی کارا لە دامەزراندنی میرنشینەکان.

---

١- الهمداني، تكملة تاريخ الطبرى، تحقيق، محمد ابو الفضل ابراهيم، الطبعة الثانية، دار المعارف، القاهرة ١٩٨٢، ص٢٦٤.

## تەوەرەی دووەم/ هۆکارە دەرەکیەکان

### ١- لاوازی خەلافەتی عەبباسی

لەبەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیەدا ئاماژەمان بە زیادبوونی دەسەڵات و پلەوپایەی تورکەکان کرد لە مەڵبەندی خەلافەتدا کاتێك(المتوکل) هەستی بە مەترسی سەرکردە سوپاییەکان کرد، چونکە دەستیان لە کاروباری سیاسی وەردەدا، بۆیە هەوڵیدا سنوورێك بۆ دەسەلاتیان دابنێ، بۆ ئەم مەبەستە گەڕانەوەی(ایتاخ)ی تورك لە مەکەوە بەرەو عێراق بەهەل زانی و لەڕێگەی دارودەستەی خۆیەوە توانی بەسەر (ایتاخ) زاڵبێ و بیکوژێ و کوڕەکانیشی خستە زیندانەوە[١].

لەساڵی (٢٤٤ك/٨٥٨ز) خەلیفە(المتوکل) بەرەو دیمەشق چوو تاوەکو دوور بکەوێتەوە لە دەسەلاتی سەربازی کە زۆربەی لە تورك پێکهاتبوون مەبەستی بوو دام ودەزگاکانی دەوڵەت بگوازێتەوە، بەلام لە ژێر فشاری سەربازی لەم هەوڵەی سەرکەوتوو نەبوو، گەڕایەوە شاری سامەڕا[٢]

کردارێکی تر کە(المتوکل) گرتیەبەر بۆ دانانی سنوورێك لەبەردەم دەسەلاتی تورکەکان هەڵسا بەدروستکردن و پێکهێنانی گرووپێکی سەربازی نوێ بەناوی کوڕەکەی(المعتز) بەسەرپەرشتی وەزیرەکەی (عبدالله کوڕی یحی کوڕی خاقان) کە سوپاکە زۆربەی لە عەرەب پێکهاتبوو، بەلام لەمەشدا سەرنەکەوت[٣].لە کاتیکدا پەیوەندی نێوان (المتوکل) و کوڕەکەی تری بەناوی (المنتصر) تێك چوو، بەهۆی پێشخستنی (المعتز) بۆ خەلافەت[٤]

ئەم ناکۆکی و ناتەباییە لەلایەن تورکەکان سوودی لێوەرگیرا (المنتصر)

---

١ - الطبري، م. س، ج٥، ص٢٣٢-٢٣٣.

٢- ابن كثير، م. س، ج١٠، ص٣٧٨. محمود شاكر، التاريخ الاسلامي الدولة العباسية، الطبعة السادسة، المكتب االاسلامي، بيروت ٢٠٠٠م، ج٥، ص٢١٥.

٣ - خالد عزام، م. س، ص١٦٢.

٤- ابن كثير، م. س، ج١٠، ص٣٨٢ حسن ابراهيم حسن، التاريخ الاسلام، ج٢، ص١٢

بەهاوبەشی لەگەڵ تورکەکان پیلانێکیان بۆ(المتوكل)ی باوکی دارشت و[1]، لە ساڵی (٢٤٧ك/٨٦١ز)کوشتیان [2].

هەرلەم روانگەوە (عبدالعزيز الدوری) دەڵێت((كوژرانی المتوكل ئاژاوەو شڵەژانێکی زۆری لە خەلافەت نایەوە، تورکەکان دەستیان بەسەر خەلافەت داگرت، ئەوە بووە پاڵنەرێك بۆ میرەکانی دەوروبەری بۆ جیابوونەوە لە خەلافەتی عەبباسی بەتایبەتی لە ئێران و میصر))[3].

هەرلەشەوی کوژرانی(المتوكل)دا (محمد المنتصر)ی کوڕی بوو بەخەلیفە[4]، بەهاوکاری تورکەکان[5]. بەڵام پەیوەندی تا سەر لەگەلیان باش نەبوو کەدەی گوت ((تورکەکان بکوژی خە لیفە کانن))[6]. لەبەر ئەوە هەوڵی زاڵبوونی دەدا بەسەریان، بەڵام تەمەنی فەرمانڕەوایی درێژخایەن نەبوو، لە ساڵی (٢٤٨ك/ ٨٦٢ ز) بەپیلانێکی تورکەکان کوژرا[7].

---

١ - الأربلي، خلاصة الذهب المسبوك، ص٢٢٦.

٢ - اليعقوبي، تاريخ اليعقوبی، ج٢، ص٤٦ المسعودي، التنبيه والأشراف، ص٣٢٩. ابن الطقطقي، م. س، ص٢٣٧، الذهبي، تاريخ الاسلام (ووفيات المشاهير و الأعلام) حوادث و وفيات سنة (٢٤١-٢٥٠هـ) تحقيق، عمر عبدالسلام تدمري، الطبعة الثالثة، دارالكتاب العربی، بيروت ١٩٩٩، ص١٨.

٣ - دراسات فی العصر العباسی المتأخر، شركة الرابطة للطبع والنشر، مطبعة السريان-بغداد ١٩٤٥، ص٥٩.

٤ - اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص ٢٤٦. المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص١١٦ . الذهبي، حوادث و وفيات (٢٤١-٢٥٠هـ)، ص١٨.

٥ - الاربلي، م. س، ص٢٢٦. ابن الوردي، م. س، ج١، ص٣٤٣

٦- الكتبي، فوات الوفيات، تحقيق، محمد محيى الدين عبد الحميد، مكتبة النهضة المصرية، مصر ١٩٥١، ج١، ص٣٧٣. السيوطی، م. س ، ص٣٥٧.

٧ - البكجري الحنفي، م. س، ص١٢٦. محمد سهيل طقوس، تاريخ الدولة العباسية، الطبعة الخامسة، دار النفائس، بيروت ٢٠٠٥، ص١٦٤.

تورکـەکان ترسـیان هـەبوو کـە یـەکێك لـە کوڕەکـانی (المتوکـل) دەسەڵات وەربگرێت و داوای خوێنیان لێبکات[1] بۆیـە کۆك بـوون لەسـەر ئـەوەی کـە خەلافـەت بـدرێت بـە(ابوالعبـاس احمـد کـوڕی المعتـصم) کـە نازنـاوی(المـستعین) بـوو[2] لـە سـاڵی (٢٤٨ك/٨٦٨ز)دا دەسـەڵاتی وەرگـرت[3]، لـە سـەرەتادا هەڵـستا بـە دەسـتگیر کـردن و زینـدانی کردنی(المعتز و المؤید) کوڕانی (المتوکل)[4]

لەسـەردەمی فـەرمانڕەوایی (المـستعین) شـەڕێکی گـەورە لـە نێـوان موسـلمانەکان و ڕۆمـەکان ڕوویـدا کـە تیایـدا سـوپای عەبباسـی شکـستی خـوارد و ژمارەیـەکی زۆریـان لێکـوژرا[5]، لەهـەمان کاتـدا بـارودۆخی خەلافـەتیش لـەبار نـەبوو، تورکـەکان باڵادەسـت بـوون بەسـەر دام و دەزگاکـانی دەوڵـەت بـۆ رزگـار بـوون لـەم قەیرانـە (المـستعین) شـاری (سامەڕا)ی بەجێدەهێڵێ و ڕوودەکاتە بەغدا [6]

هاوکـات لەگـەڵ ئـەوەدا (المعتـز) لـە زینـدانی دەردەچـێ[7] وەکـو کاردانەوەیـەك لەلایـەن تورکـەکان دەکرێـت بـە خەلیفـە و (المـستعین) لـە دەسەڵات لادەبەن[8] سەرئەنجام دەبێتە هۆی بەرپابوونی جەنگ بـۆ مـاوەی چەند مانگێك لە نێوان هەردوو ناو براودا کە شەڕەکە لە بەرژەوەندی (المعتز) کۆتایی دێت[9] دواجار (المستعین) ناچار دەکەن واز لە دەسەڵات بهێنـێ[10]،

---

١ - ابن الطقطقي، م. س، ص٢٤٠ — السيوطي، م. س، ص٣٥٨.

٢- ابن الطقطقي، م. ن، ص٢٤٠ السيوطي، م. ن، ص٣٥٨

٣ - الأربلي، م. س، ص٢٢٩. ابن الكازروني، م. س، ص١٥٣.

٤ -القلقشندي، مأثرالانافة في معالم الخلافة، ج١، ص٢٤١.

٥ الطبري، م. س، ج٥، ص٣٩٠. القلقشندي، مأثر الأنافة، ج١، ص٢٤١.

٦ - المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص١٤٥. السيوطي، م. س، ص٣٥٨.

٧ - ابن الوردي، م. س، ج١، ص٣٤٦. محمود شاكر، م. س، ج٦، ص٥٣

٨ المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص١٤٥.

٩ - الذهبي (حوادث و فيات ٢٤١ — ٢٥٠ هـ)، ص٢٢. السيوطي، م. س، ص٣٨٥. حسن ابراهيم حسن، التاريخ الاسلامی، ج٢، ص١٤.

١٠ - الطبري، م. س، ص٤٤٦. ابن الوردي، م. س، ج١، ص٣٤٦.

دوابەدوای حەوت مانگ لە لادانی دەیکوژن[1]. بێگومان ئەوەش کاریگەری خراپی لەسەر بارودۆخی دەوڵەت هەبووە و فاکتەرێکی کاریگەر بووە بۆ نەمانی پێگەو سەنگی خەلیفە کە ڕەنگدانەوەو کاردانەوەی لەسەر هاوکێشە سیاسییەکان هەبووە، بەهەمان شێوە هۆکارێك بووە بۆ لاوازی باری ئابووری دەوڵەت و خراپی بژێوی ژیانی خەڵك، کە دەرئەنجامەکەی بێ هێزی و لاوازی لێکەوتەوە.

لە ساڵی (٢٥٢ك/ ٨٦٦ز) دا (المعتز) بەشێوەیەکی فەرمی بوو بە خەلیفە، بەڵام سەردەمی فەرمانڕەواییەکەی پڕبوو لە ئاشوب و ئاژاوەنانەوە، بەڵکو تەنها بەناو دەسەڵات داربوو لە ڕووی کردارییەوە تورکەکان باڵادەست بوون، بۆیە لە ساڵی(٢٥٥ك/٨٦٨ز) دا، لەژێر فشاری ئەوان دەستبەرداری خەلافەت دەبێت[2]. دوای چەند ڕۆژێك لە دەست لەکار کێشانەوەی لەلایەن تورکەکانەوە دەکوژرێت[3]. ئینجا (المهتدی) دەبێت بە خەلیفە، بەڵام تەمەنی فەرمانڕەوایی دریژخایەن نەبوو، کەمتر لە ساڵێکی خایەند و هاوشێوەی ئەوانی تر چارەنووسی کوشتن بوو[4].

لەڕاستیدا دەوڵەتی عەبباسی لە بارودۆخێکی ناسەقامگیر و نالەباردابوو، خەلیفەکان هیچ دەسەڵاتێکیان نەمابوو، نەیانتوانی ئەم هەلومەرجە بگۆڕن، وەکو (ابن الطقطقی) دەڵێ: ((تورکەکان هەرلە کاتی کوژرانی المتوکل لەسەر دەوڵەت باڵادەست بوون، خەلیفەکانیان دەچەوساندەوە، خەلیفە لە دەستیان وەك دیلێك وابوو، ئەگەر ویستیان

١ - الذهبي، دول الاسلامي، ج١، ص٢٢٣ — المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق، محمد عبدالقادر عطا، دارالكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٧، ج١، ص١٢٠.

٢ - المسعودي، التنبيه والاشراف، ص٣٣٢. البغدادي، تاريخ البغداد، ج٤، ص١١٩.

٣ - الدياربكري، م. س، ج٢، ص٣٤. الكتبي، م. س، ج١، ص٣٧٤. ابن العماد، شذرات الذهب، ج٢، ص ٢٤٦.

٤ - البغدادي، تاريخ البغداد، ج٤، ص١٢٠.

لەسەر بوابە دەیان هێشتەوە، ئەگەر بیان ویستایە لایاندەدا لە دەسەڵات، یاخود دەیان کوشت))[1].

ئەم بارودۆخەی خەلافەت رێگا خۆشکەرێك بوو، بۆسەر هەڵدانی بزووتنەوەی(زنج – پێست رەشەکان) لە باشووری عێراق[2]، کە بزووتنەوەیەکی زۆر مەترسیدار بوو لەسەر ئایندەی خەلافەت.

دەبینین زنجیەکان توانیان لەنێوان سالآنی (٢٥٥ك/٨٦٨ز–٢٦٨ك/٨٧٤ز) هێرش بکەنە سەر شاری بەسرا و دەوروبەری پاش تێکشکانی سوپای خەلافەی عەبباسی دەسەڵاتیان فراوان بوو تا ناوچەی ئەهوازو عبادان و واست کە سیاسەتێکی توندوتیژ و تۆقاندنیان بەکار دەهێنا ئەو شارانەی کە دەستیان بەسەردا گرتبوو، وێرانیان دەکرد و خەڵکێکی زۆریان کوشت[3] ئەم بزووتنەوەیە هەرەشەیەکی زۆری لەسەر دەوڵەتی عەبباسی دروست کرد تا ئەو رادەیەی وای لە خەلیفە (المعتمید) کردبوو لە ساڵی(٢٦٧ك/٨٨٠ز) بیر لە هەڵاتن بکاتەوە بەرەو ولاتی میسر[4].

بێگومان ئەوە لاوازی خەلیفەو دەوڵەت دەگەیەنێ، تەنانەت نەیان دەتوانی بەرگری لە مەرکەزی دەسەڵات بکەن. لەڕاستیدا باردۆخەکان ئەوندە شلەژاو ناجێگیر بوون هاتنی خەلیفەکان بە دوای یەکدا بۆ سەر دەسەڵات چارەسەر نەبوو، بۆ ئەو هەلومەرجەی کە خەلافەت پێدا تێدەپەری، بەڵکو زۆرجار ئەمە بارودۆخەکەی خراپتر دەکرد.

---

١ – الفخري، ص٢٤٢.

٢- المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص١٧٢.

٣ - فاروق عمر فوزي، نشأة الحركات الدينية السياسية فى الاسلام، عمان – الأردن ١٩٩٩، ص٣٢٣.

٤- السيوطي، م. س، ص٣٦٥. طالب جاسم حسن، المقاومة العربية للتسلط البويهي فى العراق والجزيرة الفراتية، رسالة ماجستير، كلية الاداب – جامعة بغداد ١٩٨٦، ص٦٨.

هـاتنی خەلیفـە (المقتـدر) لـە سـاڵی (٢٩٥ك/٩٠٧ن) دوای خەلیفـە (المكتفی) برای[1] خەلافەتی عەبباسی زیاتر بەرەو لاوازی برد،چونكە تەمەنی لە سێزدە ساڵ تێپەڕی نەكردبوو[2]، تا ئەو سەردەمە لە خەلافەتی عەبباسـی كـەس لـەم تەمەنــە دەسـەڵاتی وەرنـەگرتبوو كـە لـەڕووی جەسـتەوە پێنەگەیـشتبوو[3]. بێگومـان ئەمــەش دیاردەیەكـە لـە دیاردەكـانی لاوازی خەلافەت فاكتەرێك بوو، بۆ لاوازبوونی هێزی دەوڵەت لەبەر ئەوەی (المقتـدر) لــە ڕووی سیاســی و ســەربازییەوە شــارەزایی نــەبوو، بــەڵكو كەسـانی دەوروبەری كاروبارەكانیان بۆ هەڵدەسووڕاند بە شێوەیەك كە بەرژەوەندی و ویستی خۆیانی لەسەربێت.

(ابــن الطقطقــی) لەباســی ســەردەمی (المقتــدر) دەڵــی(دەوڵــەت تێكەڵاویەكی زۆری بەخۆیەوە بینی بەهۆی بچووكی تەمەنیـەوە كـە دایكی و خێزان و خزمەتكارەكان دەستیان بەسەرداگرتبوو، كاروباری دەوڵەت لەسـەر ویـستی خێــزان و خزمــەتكارەكان بــەڕێوەدەبرا، كــە ســەرقاڵ بــوون بــە خۆشگوزەرانییەوە)[4].

هەرلەسەرەتاكانی سەردەمی (المقتدر) خەلافەتی عەبباسـی لاوازی و هەرەسهێنان و ناسەقامگیری و شڵەژانی بـە ڕوونـی پێـوەی دیـاربوو، لەگـەڵ زیـاد بـوونی گەنـدەڵی ئیـداری و بڵاوبوونـەوەی بـەرتیل لـە نێـوان زۆربـەی كاربەدەستاندا.[5]

---

١ - المسعودي، التنبيه و الأشراف، ص٣٤٢. المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٥٨. دياربكري، م. س، ج٢ ، ص٢٤٥.

٢ - الطبري، م. س، ج٥، ص٧٣٦. المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٥٨.

٣- ابن الكازروني، م. س ، ص١٧٢.

٤ - الفخري، ص٢٦٢.

٥ - حمدان عبدالحميد الكبيسى، عصر الخليفة المقتدربالله، مطبعة النعمان، النجف ١٩٧٤، ص ٣٤١ — ٣٤٢.

دەرئـەنجامی ئـەو بارودۆخـەوە سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و لاوازییەی کە دەوڵەتی عەبباسی بە خۆیەوە بینی ڕووبەڕووی بزووتنەوەیەکی هەڵگـەڕاوەی بەرهەڵـستیکاری وەك (القرامطـة) بـۆوە مەترسـیان زیـادیکرد لەناوچەکانی عیراق[1] و بـەحرین کـە هەڕەشـەیان بۆسـەر خەلافـەت دروسـت دەکرد[2].

لەگەڵ بوونی ئەو مەترسیانەش بۆ جاری دووەم سەرکردەکانی سـوپا لـە سـاڵی (٣١٧ك/٩٢٩ز)دا (المقتـدر)یـان لـە خەلافـەت لابـرد[3]. بـەلام دوای گەڕانەوەی بۆسـەر دەسـەڵات بـەهۆی تێکـچوونی پەیوەنـدی لەگـەڵ (مـؤنس الخادم) کە سەرکردەی سـوپایی بـوو، لـە سـاڵی (٣٢٠ك/٩٣٢ ز)دا (المقتـدر) دەکوژرێت[4].

دوابەدوای ئەمە (القاهربالله) لەساڵی(٣٢٠ك/٩٣٢ز)دا دەبێت بە خەلیفە کە کەسایەتییەکی خوێنڕێژبوو، حەزی زۆر لە کۆکردنـەوەی مـاڵ و سـەروەت وسامان دەکرد لەسیاسەتدا شارەزانەبوو[5]. بەشداری سەربازی لە کارو باری خەلافــەت زیــادی کــرد[6]، بۆیــە (القــاهر) یــان لــە خەلافــەت لابرد،کــە دەسەڵاتەکەی دووساڵی نەخایەند[7].

سەردەمی فەرمانڕەوایی (الراضي بالله) لە سـاڵی (٣٢٢- ٩٢٩ك/٩٣٤-٩٤٠ز)[8]دا جیادەکرێتەوە بە زیادبوونی کێشە و گیروگرفتەکان، بـارودۆخێکی

---

١- الطبري، م. س، ج٦، ص٦٠. ابن كثير، م. س، ج١١، ص١٤٢.

٢- ابـن كـثير، ن.م، ج١١، ص١٣٤. فـاروق عمـر فـوزي، نـشأة الحركـات الدينيـة الـسيا سية فـى الاسلام، ص٢٢٣.

٣- ابن الوردي، م. س، ص٢٨٩. ابن الكازروني، م. س، ص ١٧٢ – ١٧٣.

٤ - المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٧٠. الدياربكري، م. س، ص ٢٥٠.

٥ - ابن الطقطقي، م. س، ص ٢٧٦. القلقشندي، ماثر الانافة، ج١، ص٢٨١.

٦ - ابو الفدا، المختصر فى اخبار البشر، ج٢، ص٧٧.

٧ - المسعودي، التنبيه و الاشراف، ص٣٥٢.

٨ - المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٨٦. ابن الكازروني، م. س، ص١٧٩ – ١٨٠.

ناجێگیرو شڵەژاو هاتە ئاراوە، کاتێك خەلیفەی عەبباسی دەستەوەستان بوو، لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بەهۆی چەوسانەوەیان لەلایەن سەرکردەی سوپایی و کەمی داهات کە نەیان دەتوانی پێداویستییە مادییەکان پڕبکەنەوە بەتایبەتی دابینکردنی موچەی سوپا[1].

بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتانە (الراضي) لە ساڵی(٣٢٤ك/٩٣٥ ن) داوای لە (محمد کوڕی رائق) کرد کارەکانی دەوڵەت بگرێتە ئەستۆ و پلەی (اميرالامراء – میری میران)ی پێبەخشی[2].

لەڕاستیدا بەخشینی پلەی(میری میران) چارەسەرێك نەبوو، بۆ کێشەکان، بەڵکو بارودۆخەکەی خراپترکردو بووە هۆی ململانێ لەسەر بەدەست هێنانی ئەو پلەیە[3]، تا ئەو رادەیەی خەلیفە هیچ دەسەڵاتێکی نەمابوو، تەنها لە چوار چێوەی بەغدا نەبێت[4]. هەرێمەکانی سەر بەدەوڵەتی عەبباسی هەرناوچەیەك لەلایەن کەسێك، یاخود بنەماڵەیەکەوە دەستی بەسەرداگیرابوو، خۆزستان بەدەست بریدیەکانەوە بوو، وڵاتی فارس (عمادالدوله ابن بويه) داگیری کردبوو، موصل و دیاربەکر لە ژێر دەسەڵاتی حەمدانییەکان بوو، بەهەمان شێوە لە وڵاتی میسر و شام ئەخشیدییەکان فەرمانڕەواییان دەکرد[5].

بێگومان سەرهەڵدانی ئەو هێزانە لە ئەنجامی لاوازی خەلافەتی عەبباسیەوە هاتبووە ئاراوە، تێکچوونی سەقامگیری دەسەڵاتی مەکەزی، رەنگدانەوەی هەبوو، لەسەر ئەم ناوچانەی سەر بەخەلافەت بوون، هەرێمە کورد نشینەکانیش وەکو بەشێك لە چوارچێوەی دەوڵەتی عەبباسی لەو

---

١ - جرجي زيدان، تاريخ التمدن الاسلامي، راجعها وعلق عليها، حسين مؤنس، دار الهلال، بيروت (د.ت)، ج١، ص١٦٠.

٢- ابن كثير، م. س، ج١١، ص٢٠٣. محمد سهيل طقوش، م. س، ص١٦٩.

٣ - ابن العمراني، الإنباء فی تاريخ الخلفاء، ص١٦٤. القلقشندي، ماثر الانافة، ج١، ص٢٨٩.

٤- ابن كثير، م. س، ج١١، ص٢٠٣.

٥ - ابن الوردي، م. س، ج١، ص٤٠١. مؤلف مجهول، العيون و الحدائق، ج٤، ص٤٨.

گۆڕانکاریانــه بێبــەش نــەبوون، بــەڵکو لاوازی دەســەڵاتی مەرکــەزی رێگــە خۆشکەرو هۆکارێکی سەرەکی بوو، بۆ سەرهەڵدانی میرنشینە کوردییەکان.

## ٢- دیاردەی جیاخوازی

خەلافــەتی عەبباســی شــێوازێکی جیــاوازی هــەبوو لــەڕووی فەرمانڕەوایی و سنووری دەسەڵات لەگەڵ دەوڵەتی ئەمەوی، کە بـاڵا دەست بـوو بەسـەر هـەموو هەرێمـەکانی هـیچ جـۆرە جیـاخوازی و جیابوونـەوە لـە دەوڵــەتی ئومــەوی دا ڕووینــەدا، بــەڵام عەبباســییەکان هــەر لەســەرەتای دروســتبوونیانەوە، هەنــدێ بەشــی جیــاخوازی بەخۆیــەوە بینــی، وەك قەوارەیــەکی ســەربەخۆ لــەدەرەوەی دەوڵــەت مومارەســەی دەســەڵاتی سیاسییان دەکرد، چەند میرنشینێك دروست بوون لە ناوچەکانی ئەنـدەلوس و(المغرب الاقصی– مەغریبی دوور) و هەرێمی خوراسان کـە لـە چوارچێوەی سـنوورێکی سـنووردار فـەرمانڕەواییان دەکـرد، چـەندە دەوڵـەتی مەرکـەزی هــەژمونی کــەمتر دەبـوو، دەسەڵاتیـشی بـەرەو لاوازی دەچـوو، ئەوەنـدش هەرێمەکان و ناوچەکانی سەر بە خەلافەت جیابوونەوەی خۆیان رادەگەیاند.

هــەر لەدەســتپێکی دەوڵــەتی عەبباســیدا سیاســەتییان بەرامبــەر نەیارەکانیان توندوتیژ بوو، هەوڵیانداوە لەڕێگەی هێزەوە سەرکوتیان بکەن، ئەوەش وای کـردوە کـە ویـستی سـەربەخۆیی و خۆرزگـار کردنیـان لـە لایـان گەشەی بکات، لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە توندەی کە بەرامبـەر ئومەوییـەکان بــەکاریان هێنــا (عبــدالرحمن کــوڕی معاویــە) تــوانی لــەژێر دەســەڵاتی عەبباســـییەکان رزگــاری بێــت و رووی کــردە ئەنــدەلووس لــە ســاڵی (١٣٨ك/٨٥٦ن) دەسەڵاتێکی تایبەت بەخۆی لە چوارچێوەی میرنـشینێك لـە شێوازی سیستەمی پشتاوپشت دامەزراند[1]. دوور لە دەسـەڵاتی مەرکـەزی،

١ - ابن الأثير، الكامل، ج٥، ص٧٥- ٧٩. عبدالمنعم الهاشمي، الخلافة الاندلسية، دار ابن حزم، بيروت ٢٠٠٧، ص١٤٧. على محمد محمد الصلابى، صفحات مشرقة من التاريخ الإسلامى، دار الفجر للتراث، القاهرة، ٢٠٠٥، ج٢، ص٢٢٨.

لەگەڵ ئەوەی عەبباسییەکان هەوڵی زۆریان داوە بۆ گەڕانەوەی ئەم بەشە بۆ چارچێوەی دەوڵەتەکەیان، بەڵام لە هەوڵەکانیان سەرکەوتوو نەبوون[1].

لە راستیدا بزووتنەوەی جیاخوازی لە دەوڵەتی عەبباسی پەیوەست بوو لەسەر چەند بنەمایەکی جیاواز کە فاکتەری سەربەخۆیی و ویستی تاکەکەس بۆ گەیشتن بە دەسەڵات هۆکاری سەرەکی بوون بۆ سەرهەڵدانی دیاردەی جیاخوازی، لەگەڵ ئەوەی ململانێی سیاسی لەم بوارەدا رۆڵی خۆی بینیوە، هاوکات هەبوونی جیاوازی ئاراستەی رێبازی ئاینی لەو نێوەندەدا کاریگەری خۆی هەبووە، سەرەڕای ئەمەش پەیڕەوکردنی سیاسەتی شەڕو توندوتیژی کاردانەوەو ڕەنگدانەوەی لێکەوتۆتەوە.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خەلیفە(الهادی) لە ساڵی(١٦٩ ك/٧٨٥ز)دا، لەشەڕێکدا لە حیجاز رووبەڕووی عەلەوییەکان وەستا، هەوڵی لەناوبردنیانیدا (ادریس کوڕی عبدالله)ی عەلەوی دوای شکستهێنانیان بەرەو وڵاتی مەغریب هەڵات[2].

سەرەنجام توانی پشتگیری خەڵکی مەغریب بەدەستبهێنێ و لە ساڵی(١٧٢ك/٧٨٨ز)دا دەوڵەتی(الادارسە– ئیدریسیەکان) بە هاوکاری و پشتیووانی بەربەرەکان دامەزراند[3]، هەرچەندە (هارون الرشید) توانی لە رێگەی نێردراوێکیەوە (ادریس) ژەهرخوارد بکات، بەڵام نەیتوانی کۆتایی بە دەسەڵاتیان بهێنێ، بەڵکو کوڕەکەی جێگەی باوکی گرتەوە، لە فەرمانڕوایی ئەو دەوڵەتە بەردەوام بوو[4]، کە لەڕووی کرداریەوە لە دەوڵەتی عەبباسی جیابۆوە.

هەر لەسەردەمی خەلیفە(هارون الرشید) بەهۆی ئەو بارودۆخە ناجێگیرەی لە ئەفریقا واتە(وڵاتی تونس) هاتە ئاراوە (ابراهیم کوڕی

---

١ - ابن الأثير، م. ن، ج٥، ص٢٢٥. ابن الوردي، م. س، ج١، ص٢٩٢.

٢ - الطبري، م. س، ج٤، ص٦٤٩. القلقشندي، مآثر الانافة، ج١، ص١٩١.

٣ - حسن ابراهيم حسن، م. س، ج٢، ص١٨٢. ستانلى لين بول، الدول الأسلامية، ص٧٣.

٤ - ابن الأثير، الكامل، ج٥، ص٢٦٢-٢٦٣. عبدالعزيز الدورى، العصر العباسى الاول، ص١٠٩.

الاغلب)ی کردە، والی ئەو ناوچەیەوە[1] ناوبراو توانی بە زیرەکی و لێهاتوویی لە ساڵی(١٨٤ك/٨٠٠ز)دا میرنشینی ئەغالیبە دابمەزرێنێ[2].

بێگومان ئەو میرنشینانەی باسیان لێوە دەکەین جیابوونەوەی خۆیان لە خەلافەتی عەبباسی راگەیاند بوو، شێواز و جۆری پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزی هاوشێوەی یەك نەبوو، هەندێکیان بە زەبری هێز دەستیان بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان داگرتبوو، کەمێکیشیان لەژێر فەرمانی مەرکەزەوە کارەکانیان بەڕێوەدەبرد، بەتایبەتی لە بواری شەڕو ئاشتیدا، واتە جیاوازی لە نێوان میرنشینەکاندا هەبوو، لە رووی پەیوەندی سیاسی و سەربازی لەگەڵ حکومەتی ناوەند[3].

وڵاتی ئێرانیش وەك بەشێك لە چوارچێوەی دەوڵەتی عەبباسی بزووتنەوەی جیاخوازی تێدا سەریهەڵدا کە هەندێکیان پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵ خەلافەت هەبووە، هەندێ جاریش هەڕەشەو مەترسیان دروست کردووە. لە ساڵی( ٢٠٧ك/٨٢٢ز)دا طاهیرییەکان کە بنەماڵەیەکی فارس بوون، لە ناوچەی خوراسان سەربەخۆییان راگەیاند، بەسەرکردایەتی(طاهر کوڕی الحسین)[4] کە یەکێك بوو، لە سەرکردە سوپاییەکانی خەلیفە(المأمون) و رۆڵی کارای گێڕا لە سەرکەوتنی (المأمون) بەسەر (الامین)ی برای لەشەڕی ناوخۆیی کە لە بەغدا روویدا [5]، دوابەدوای

---

١- المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص٢٥٦. ابن الوردي، م. س، ج١، ص٣١١.

٢ - اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٢٨٩. عبدالحليم عويس، دراسة لسقوط ثلاثين دولة إسلامية، الطبعة الرابعة، دارالوفاءللطباعة والنشر، المنصورة ٢٠٠٢م، ص١٣٧.

٣- الماوردي، الأحكام السلطانية والولايات الدينية، تحقيق، خالد عبدالطيف السبع الحلبى، الطبعة الثالثة، دار الكتاب العربى، بيروت ١٩٩٩، ص٧٢-٧٨.

٤ - الطبري، م. س، ج٥، ص١٨٥- امير حسن صديقي، الخلافة والملكية فى ايران فى العصرالسيط، ترجمة، احسان ذنون الثامرى، تقديم، عبدالعزيز الدورى، منشورات الجمل، بغداد ٢٠٠٧، ص٣٥.

٥ - اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٣١٠. المسعودي، التنبيه والإشراف، ص٣١٦-٣١٧. ابن العمرانى، م. س، ص٩٠. اليافعى، م. س، ج١، ص٣٥٠.

ئەوە لە ساڵی(٢٠٥ك/٨٢٠ز) دا (طاهر) كرا بەوالی خوراسان[١].بەهۆی ئەو شارەزاییە زۆرەی لەڕووی ئیداری و سەربازییەوە هەیبوو، بۆیە(المأمون) ئامانجی لە دەستنیشان كردنی (طاهر) ئەوەبوو كە زاڵبێت بەسەر بزووتنەوە هەڵگەڕاوەكان و سەرپێچی كارەكان بە تایبەتی خەواریجەكان[٢]،سەرئەنجام ناوبراو سوودی وەرگرت لەو دەسەلاّت و پێگە جەماوەرییەی كە لە خوراسان هەیبوو، لە دەوڵەتی عەبباسی جیابۆوە[٣]، بەلاّم زۆر جار طاهیریەكان لەلایەن عەبباسییەكانەوە، بەكاردەهاتن بۆ لێدانی نەیارەكانیان ئەوەتا هاوكاری و بەشداری (عبدالله كوری طاهر) لەگەڵ سوپای خەلافەت دژی بزووتنەوەی خورەمی (مازیار) بەشێك بوو لەو پەیوەندی و پاڵپشتەی بەرامبەر دەوڵەتی مەركەزی[٤].

بێ هێزی دەوڵەتی ناوەند فاكتەرێكی كاریگەر بوو لەسەرهەڵدانی میرنشین و دیاردەی جیاخوازی، بیرۆكەی سەربەخۆیی بەشێوەیەك كە نەیدەتوانی هەژموونی لەسەر هەموو ناوچەكانی ژێر دەسەلاّتی بكات و بیپارێزی.

هەرێمی سجستان[٥] باردۆخێكی ناجێگرو پەشێوی بە خۆیەوە بینی بەهۆی زیادبوونی مەترسی خەواریج بۆ ئەم مەبەستە گرووپێك لە

---

١ - ابن الأثير، الكامل، ج٥، ص٥١٣. القلقشندي، ماثر الانافة، ج١، ص٢١٦.

٢ - الطبري، م. س، ج٥، ص١٧٥. ميسون هاشم مجيد، علاقة الخلافة العباسية بدويلات المشرق فى القرن الثالث الهجرى وحتى نهاية القرن الخامس الهجرى، رسالة ماجستير، جامعة الموصل ١٩٨٢، ص١٧.

٣- قحطان عبدالستار الحديثى، الدولة العربية فى العصر العباسى المتأخر و الحركات الانفصالية فى ايران، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٨٧، ص١٠٣.

٤ - ابن الجوزي، المنتظم، ج١٠، ص١٦٠. ابن الأثير، الكامل، ج٥، ص٥٦١ - ٥٦٢. الذهبي، تاريخ دول الأسلام، ج١، ص٩٨. خليل ابراهيم السامرائى، م. س، ص٤٣- ٤٤.

٥ - سجستان، هەرێمێكی گەورەو فراوانە لە رۆژهەلاّتی - ئیسلامی دەكەوێتە باشوری هرات لە خوراسان.(ئێستا ناوچەكە دابەشكراوە لە نێوان أیران و أفغانستان) ياقوت الحموى، م. س، ج٣، ص١٩٠. القزويني، م. س، ص٢٠١

خۆبەخشكاران پێكهات بۆ بەربەست كردنی هەڕەشەكانیان لە نێوانیاندا (یعقوب كوڕی لیث) ی سەفاری دەركەوت و توانی ببێت بەسەركردەی خۆبەخشكاران و شكستێكی گەورە بە خەواریجەكان بێنێ و زاڵ بوو بەسەر سجستان و چەند ناوچەیەكی تر[1]. بەم شێوەیە (یعقوب) لەساڵی (٢٥٤ك/٨٦٧ز)دا بناغەی میرنشینی سەفاری دامەزراند[2]. لە فراوان خوازییەكانی بەردەوام بوو تا لە ساڵی (٢٥٩ك/٨٧٢ز)دا توانی دەست بەسەر خوراسان دابگرێت و فەرمانڕەواكەی(محمد كوڕی طاهر) دەستگیر بكات[3]. ئەم كردارانەی (یعقوب) خەلافەتی عەبباسی نیگەران كردبوو، بۆیە خەلیفە (المعتمد) سوپایەكی ئامادە كرد بەسەركردایەتی (الموفق)ی برای بۆ بەرهەڵستی كردنی سەرئەنجام توانی شكست بە (یعقوب) بهێنێ[4].

لە كاتێكدا كە مەترسی سەفارییەكان زیادی كرد خەلیفە (المعتمد) فرمانیدا بە دەستنیشان كردنی (نصر كوڕی احمد)ی سامانی لەسەر وڵاتی ئەو دیوی رووبار لە ساڵی(٢٦١ك/٨٧٤ز)، ئەوە بەسەرەتای دروست بوونی میرنشینی سامانی دادەنرێت كە شاری (بخارا)[5] ی كردە بنكەی دەسەڵاتیان[6].

دەكرێت بڵێین خەلافەتی عەبباسی مەبەستی هەبوو، لە دانان و دەستنیشان كردن و پاڵپشتی كردنی سامانییەكان تا بیانكات بە بەربەستێك

---

١ - ابن الأثير، الكامل، ج٦، ص٢٤٧ — ٢٤٨.

٢ - ستانلی لین بول، الدول الأسلامية، ص٢٦٣. سوادی عبد محمد، دراسات فی تاريخ دويلات المشرق الاسلامی، جامعة البصرة، ص٣٦.

٣ - الذهبي، دول الأسلام، ج١، ص٢٣١. ابن العماد، م. س، ج٢، ص١٣٩.

٤ - ابن الأثير، الكامل، ج٦، ص٣٢٣- ٣٢٤. الذهبی، دول الأسلام، ج١، ص٢٢٤.

٥ - بخارا، لە گەورەترین شارە كانی ئەودیوی رووبارەی جیحونە، كە ئێستا پێی دەوترێ ئاموداریا. یاقوت، م. س، ج١، ص٣٥٣.

٦ - احمد مختار العبادي، فی التاريخ العباسی و الفاطمي، دار النهضة، العربية، بيروت (د.ت)، ص١٥٢.

لەبەردەم فراوان خوازی و هەڕەشە و مەترسی سەفارییەکان، وەك دەبینین لێدان و کۆتایی پێ هێنانیان لەسەر دەستی سامانییەکان ئەنجام درا بە پاڵپشتی خەلافەت[1].

ولاتی شام و میسریش هاوشێوەی ناوچەکانی تر دەسەلاتی سەربەخۆیی تێدا هاتە ئاراوە کە (احمد کوڕی طولون) لە ساڵی (٢٥٤ك/٨٦٨ز) دەوڵەتی تولونی لە ولاتی میسر دامەزراند[2]. دەسەلاتی تەنها لە میسر سنووردار نەبوو، بەڵکو ناوچەکانی شام و فەلەستینیشی لە خۆ گرتبوو[3] ئەوەی یارمەتی تولونییەکانیدا لە فراوان خوازییەکانیان و درێژبوونەوەی دەسەلاتیان بۆ ئەم هەرێمانە سەرقاڵی خەلافەتی عەبباسی بوو، بەدامرکاندنەوە و لەناوبردنی بزووتنەوەی زنج کە لە باشووری عێراق سەریهەڵدا بوو[4]، بەلام دەوڵەتی تولونی درێژخایەن نەبوو، لە ساڵی (٢٩٢ك/٩٠٤ ز)دا لەناو دەچێت و ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان دەکەوێتەوە چوارچێوەی خەلافەت[5]. ئەوە رێگە خۆشکەر دەبێت بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئەخشیدی کە دامەزرێنەرەکەی (محمد کوڕی طغج کوڕی جف)ی ئەخشیدی بوو لە ساڵی (٣٢٣ك/٩٣٤ ز)[6]دا، لاوازی دەسەلاتی مەرکەزی بە هەل دەزانێ، ولاتی میسر و شام دەخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی[7]، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا چەند دەوڵەتێکی تر سەریان هەڵداو دەرکەوتن، لە

---

١ - الطبري، م. س، ج٥، ص٦٩٦. ابن الأثير، الكامل، ج٦، ص٥١١-٥١٢.

٢ - ابن الأثير، م. ن، ج٦، ص٢٥٠. حسين مؤنس، أطلس تاريخ الإسلام، الطبعة الثانية، مطابع الزهراء الإسلام العربى، القاهرة ٢٠٠٧م، ص٢٨٧، ص٢٨٧.

٣- المسعودي، مروج الذهب، ج٤، ص١٨٧. ابن الجوزي، المنتظم، ج١٢، ص٢١٣.

٤ - الطبري، م. س، ج٥، ص٥٠١ . القلقشندي، مأثر الانافة، ج١، ص٢٥٠.

٥ - ابن الأثير، الكامل، ج٦، ص٥٤٣. حسن ابرهيم حسن، م. س، ج٣، ص ١٣٩.

٦- ابن الوردي، م. س، ج١، ص٤٠٠. ستانلي لين بول، الدول الإسلامية، ص١٦٨.

٧- القرماني، م. س، ص٢٦٤. احمد مختار العبادي، م. س، ص١٤١.

خەلافـەت جیابوونـەوە، وەك دەوڵـەتی عەلەوییـەکان لـە ئـەفریقیا لـە سـاڵی (٢٩٦ك/٩٠٨ز)[١] و میرنشینی حەمدانییەکان لە موصل[٢].

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەی کەلـە نـاو دەوڵـەتی عەبباسـی هـاتبووە ئاراوە ئەو سیاسەتەی کە خەلیفەکان پەیڕەویان دەکرد و ئـەو لاوازییـەی کـە باڵی بەسەر دەوڵەتدا کێشابوو هـەر هێزەو لـە ناوچـەیەکەوە دەردەکـەوتن، بزووتنەوەی جیاخوازی وەکو دیاردەیەك سەری هەڵداو لە پەرەسەندندا بوو.

کوردستانیش وەك بەشێك لـە چوارچێوەی خەلافـەتی عەبباسـی لـەم گۆڕانکارییانـە بەشێکی بەرکـەوتبوو کـە رەنگدانـەوەی لەسـەر ولاتـی کـورد هەبوو، بە دەرکەوتنی چەند میرنشینێك لە چەند ناوچەیەکی جیـاواز، لەگـەڵ ئەوەی ئێمە پێمان وایە درەنگ ئەم قەوارە کوردیانە کـە خـۆی لـە میرنـشین دەبینیەوە سـەریان هەڵـداوە بەبـەراورد لەگـەڵ ئـەو دەوڵەتانـەی کـەباسمان کردن، دەکرا میر و سـەرکردە و سـەرۆك خێڵـە کوردییـەکان زوتـر سـوود لـە هەلومەرجی لاوازی خەلافەت وەربگرن بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی سەربەخۆ.

## ٣- بوەیهییەکان و کاریگەرییان لەسەر هەرێمە کوردنشینەکان

بوەیهییــەکان دانیــشتووانی ناوچــەی دیلــم[٣] بــوون.[٤] ناوەکــەیان دەگەڕێتەوە بۆ (بویە) کەنازناوی (ابـو شـجاع) بـووە[٥]، خـاوەن سـێ کـوڕی

---

١- ابن الأثیر، الکامل، ج٦، ص ٥٧٧.

٢ - فیـصل الـسامر، الدولـة الحمدانیـة فـی الموصـل وحلـب، مطبعـة الایمـان، بغـداد ١٩٧٠، ج١، ص٢٠٣. عبدالحلیم عویس، م. س، ص١٠٢.

٣ - دیلـم، هـەرێمێکی فراوانـە لـە نێـوان طبرسـتان وچـیای جـیلان لـە روژهەڵاتیـەوە بـە خوراسان لەباشوریەوە شارەکانی چیا لـەروژئاوا بـە ئازربیجان لـەباکورەوە بـە دەریـای خەزەر دەوردراوە، ابن حوقل، م. س، ص٣١٨

٤ — ابن الطقطقي، م. س، ص٢٧٧. حمد الله مـستوفي، تـاریخ گزیـدە، باهتمـام، عبـد الحـسین نوائی، چاپ چهارم، چاپخانە سپهرن، تهران ١٣٨١ش، ص٤٠٨.

٥- ابو الفدا، المختصر فی اخبار البشر، ج٢، ص٧٨.

هەبوو، بەناوی (عماد الدولە علی و رکن الدولە حسن و معزالدولە احمد)[1] کە ماوەیەکی کورت خایەند توانیان سنووریکی فراوان بخەنە ژێر رکێفی خۆیان.

لەسەرەتادا (عمادالدولە) توانی دەست بەسەر(الکرج)[2] دابگرێت، دواتر بەشێکی وڵاتی فارسی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، نێردراوێکیان بۆ خەلیفە (الراضی باللە) نارد داوایان لێکرد کە دان بەجیابوونەوەی ئەم ناوچەیەدا بنێ بەرامبەر بەوە ساڵانە هەزاران هەزار درهەمی بۆ دەنێرن[3]، بەمە بوەیهییەکان بناغەی دەوڵەتێکیان دامەزراند، سوودیان لەلاوازی خەلافەت وەرگرت. سەرئەنجام لە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) بەرەو بەغدا هاتن و خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[4].

دیارە پەرەسەندنی دەسەڵاتی بوەیهییەکان بێ بنەما نەبوو، هەروەك یەکێك لە لێکۆڵەرەوان باسی لێوە دەکات و دەڵێ: ((هۆکاری باڵادەسی کورانی بوەیهی بڵاوبوونەوەیان و دەستگرتنیان بەسەر وڵات و بوون بەخاوەنی عێراق و ئەهواز، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسیاسەتێکی باشیان پەیڕەو دەکرد لەگەڵ ژێر دەستەکانیان دا))[5].

هەرلەم بارەیەوە (مسکویە) دەڵێ: ((هۆکار لەبەرزبوونەوەی (علی کوڕی بویە) گەیشتن بەم ئاستە لێبووردەیی زۆربوو، لە سروشتی خۆی سنگ فراوان بوو، لەگەڵ ئەوەی کە ئازا و بوێر بوو[6]. ئەم خەسڵەتانە وای لە بوەیهییەکان کردبوو کە دەسەڵاتیان تەشەنە بکات.

---

١ - ابن الکازروني، م. س، ص١٧٨. القرماني، م. س، ص٢٦٩.

٢ - الکرج، شارێکە دەکەوێتە نێوان هەمەدان وئەسفهان، یاقوت، معجم، ج٤، ص٤٤٦.

٣ - ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص١٥-١٦. ابن الطقطقي، م. س، ص٢٧٨.

٤ - مسکویە، م. س، ج٥، ص٢٧٥. ابن الأثیر، م. ن، ج٧، ص١٥٧. ابو الفدا، المختصر فی اخبار البشر، ج٢، ص٩٤. ابن کثیر، م. س، ج١١، ص٢٣٢.

٥ - حسن ابراهیم حسن، م. س، ج٣، ص١١١

٦ - تجارب الأمم، ج٥، ص١٥٨.

دەبینین هاوکات لەگەڵ فەرمانڕەوایی بوەیهییەکان لە مەرکەزی خەلافەتدا، لە ناوچە کوردنشینەکان، چەند میر نشینێك دەرکەوتن، بێگومان کۆمەڵێك فاکتەر کاریگەری هەبووە، بەسەریانەوە کەرێگە بەسەرهەڵدانی دەسەلاتی کوردی بدەن.

لە کاتێکدا دەرکیان بەوە کرد، کە ناتوانن بە شێوەیەکی راستەوخۆ ناوچە شاخاویەکانی کوردستان بەڕێوەببەن، کە هاوشێوەی ولاتی خۆیانە لە رووی سەختی چیاو پێکهاتەی جوگرافی[1]. بۆیە دەست بەسەر داگرتن لە رێگەی سەربازی و دەست بەسەرکردنی میرە کوردەکان شتێکی ئاسان نەبووە، هەروەك (رکن الدولە حسین)ی بوەیهی زیاتر لە براکانی شارەزایی بارودۆخی تایبەتی ناوچە کوردنشینەکان بوو، لە نزیکەوە ئاگاداری میرو قەلاو سەرۆك هۆزەکانی کورد بوو، هەستی بەئازایی و لێوەشاوەیی هۆزەکانی هەرێمی چیا کردبوو، هەولی دەدا چاو لەچالاکی و زێدە رۆییەکانیان بپۆشێ، ئەگەر پێی بگوترایە کوردەکان رێگایان بڕی و مەڕوماڵاتیان تالان کرد، یەکسەر دەیگوت قەیدی ناکا کوردەکان وەك ئێمە پێویستیان بە خواردنە[2].

بۆیە بە جۆرێك لە جۆرەکان بوەیهییەکان رێگەیانداوە بە دروست بوونی میرنشین لە هەرێمە کوردنشینەکان تا ئەو رادەیەی کە مەترسی لەسەر ئەوان نەبێت وەك دەبینین کاتێك (باد کوڕی دو ستك) یان بەمەترسی زانی لەسەر خۆیان هەولی رووبەڕوو بوونەوەیان داوە لەبەردەم فراوانخوازیەکانی[3]، بەهەمان شێوە هێرش کردنە سەر حەسنەویهییەکان هەر لەم چوارچێوەیەدا بوو[4]، بەلام بەشێوەیەکی گشتی بوەیهییەکان رێگر

١ - بۆ جگرافیە ناوچەی دیلم بروانە، ابن حوقل، م. س، ص٣٢٠.
٢ - مسکویە، م. س، ج٥، ص٢٧٨. زرار صدیق توفیق، قوناغەکانی سەر هەلدان وگەشە کردنی میرنیشینە کوردیەکان لەسەردەمی عباسیدا، ل١٠٢.
٣ - الروذراوري، م. س، ج٦، ص٥٣.
٤ - م .. ن. ج٦، ص١٢، ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٣٧٦.

نەبوونــە لەبــەردەم ســەرهەڵدانی میرنــشین لــە هەرێمــە کوردنــشینەکان کــە ئــەوەش بــۆ چــەند هۆکارێــك دەگەڕێتەوە،لەوانــە بوەیهیــەکان خۆیــان لــە ناوچەیەکی ترەوە، هاتبوون دەستیان بەسەر بەغدادا گرتبوو، واتــە هێزێکی دەرەکی بوون، لەلایەکی ترەوە لەڕووی نەتەوەیی لەڕووی ڕێبازی ئاینی کــە هەڵگری بیروباوری شیعەگەرین لــە عەبباسییەکان جیـاواز بـوون، دانیـان بـە خەلافەت نەدەنا تەنها بە پاڵنەرێکی سیاسی نەبێت[1]، بۆیـە دژایـەتی لەگـەڵ ئەو هەموو هێزو دەسەڵاتە ناوچەیی و هەرێمایەتیانەدا شتێکی ئاسان نـەبوو، بۆمانەوەو درێژە پێدان بەدەسەڵاتیان پێویستیان بە پاڵپشتی و هاوپـەیمانی هاو هەڵوێستی هەبوو، تاوەکو درێژە بە فەرمانڕواییان بدەن.

زۆر جار کێشەیان لەگەڵ میرنشینی حەمدانییەکان هەبوو، کە فەرمانڕەوای موصـل بـوون[2] پەیوەندییـەکی زۆر گونجـاو سـەقامگیریان نـەبووە، بۆیـە شـەڕو دژایەتی ئەو هەموو هێزو دەسەڵاتانە شتێکی ئەستەمە، بەپێچەوانەوە لـە هەنـدی کاتدا سوودیان لە میرە کوردەکان وەرگرتووە بـۆ بەرهەڵـستی و دژایـەتی کردنـی ئـەو هێزانـەی کـە مەترسـیان لەسـەر بوەیهییـەکان هـەبووە[3]، هـەر لەسـەر ئـەو بنەمایـەوە (رکـن الدولـە) دەی گـوت دەوڵەتەکـەم بەسـتراوەتەوە بـە دەوڵـەتی کوردان[4]، ئەوەش خۆی لە خۆیدا دانپێدان بە دەسەڵاتی کوردی لە ناوچـە کـورد نشینەکاندا.

لەلایەکی ترەوە دەستگیر کردنی (السالار مرزبان) لەلایەن (رکن الدولە) و بوەیهییەکان ڕێگە خۆشکەرێك بوو، بۆ سـەرهەڵدانی میرنـشینی شـەدادی و

---

١- امیر حسن صدیقي، م. س، ص٦٨.

٢- ابن الأثیر، الکامل، ج٧، ص١٨٢. ابن الجوزی، المنتظمر، ج١٤، ص٢١٢ . ابوالفدا، المختـصر، ج٢، ص٩٤-٩٥. فیصل السامر، م. س، ج١، ص٢٥٧-ص٢٦٧

٣ - مسکویە، م. س، ج٥، ص٢٩٠.

٤ – م. ن، ج٥. ص٢٧٧. زرارصدیق توفیق، قوناغەکانی سەرهەلدان وگەشـەکردنی میرنـشینە کوردیەکان لەسەردەمی عەباسیدا، ل١٠٢.

ڕەوادی[1]، لەبەر ئەوە بوەیهیەکان وەك هێزێکی هاوسەردەمی دەرکەوتنی قەوارەی سیاسی کوردی لە ناوچە کورد نشینەکان هێزێکی سوود مەند بوونە و کاریگەریشیان هەبووە لەسەر شانۆی ڕووداوە سیاسییەکانی ئەوکات، ئەوە بەبەرژەوەندی کورد کەوتۆتەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەین کە زۆربەی مێژوو نووسان و توێژەرەوان پێیان وایە کە سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی سەردەمی پێشکەوتنی ئەدەب و زانست و زانیارییە لەژێر فەرمانڕەوایی بوەیهییەکان[2]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کرانەوەی عەقڵی و مەعریفی کە پەیوەندی و کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هەڵسوکەوتی سیاسی دەبێت.

دەرکەوتنی دیاردەی دووبەرەکی و ناکۆکی ناوخۆیی لە نێوان بنەماڵەی بوەیهییەکان دوای مردنی (معز الدوله) لە ساڵی (٣٥٦ك/٩٦٦ز)دا[3] کە ئەوە خۆی لەخۆیدا هۆکارێکە کە بوەیهییەکان پێیەوە گیرۆدەبوون نەیان دەتوانی بە تەواوی دەسەڵاتی خۆیان سەقامگیر بکەن و مەرکەزیەتی خۆیان بسەپێنن.

لە کاتێکدا (حبشی کوڕی معز الدوله) هەڵگەڕایەوە لەسەر (عز الدوله بختیار) ی برای کە جێنشینی (معز الدوله)ی باوکی بوو سەربەخۆیی خۆی لەشاری بەسرا ڕاگەیاند، لە گوێڕایەڵی براکەی دەرچوو، بۆ ئەم مەبەستە بختیار هێزێکی سەربازی بەسەر کردایەتی وەزیرە (ابو الفضل العباس کوڕی

---

١- مسکویه، م. س، ج٥، ص٢٩٠. احمد کسروی، م. س، ص٢٦٧. Minorsky,Studies.P.8

٢- بۆ زانیاری لەسەر ئەدەب و زانست لەسەردەمی بوەیهییەکان بگرێوە بۆ، الثعالبي، يتيمة الدهر فی محاسن اهل العصر، تحقيق، مفيد محمد قميحة، دار الكتب العلمية، بيروت ٢٠٠٠م، ص٢٥٧-٢٦١. آدم متز، الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجرى أو عصر النهضة في الاسلام، ترجمة، محمد عبد الهادي ابوريدة، الطبعة الرابعة، دارالكتاب العربى، بيروت ١٩٦٧م، بۆ نمونە بڕوانە ج١، ص٣١٩-ص٣٥٠. ص٤٣٩-ص٥٠٩. ج٢، ص١٩-١٥٦.

٣ - القرطبي، صلة تاريخ الطبري، تحقيق، محمد ابوالفضل ابراهيم، الطبعةالثانية، دارالمعارف، القاهرة، ١٩٨٢ ص٤٠٧. ابن الجوزي، المنتظم، ج١٤، ص١٨٣.

الحسين) نارد بۆزاڵ بوون بەسەر (حبشی) بەهەر شێوازێك بێت، ئەوە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی بوو لە نێوان بنەماڵەی بوەیهییەکان کەتیدا (حبشی) دەستگیر کرا[1].

بەمە سەرەتای شێوازێکی نوێ دەرکەوت لە پەیوەندی بنەماڵەی بوەیهییەکان کە قۆناغەکانی دواتر ڕێچکەیەك لە ململانێی ناوخۆیی و دابەش بوون، لەسەر دەسەڵات سەری هەڵدا، کە شوێنەوارێکی خراپی لەسەر هێزی بوەیهییەکان هەبوو، ئەوەش بەڕوونی کاریگەری لەسەر لاوازی هێزی سیاسییەوە بەدی دەکرا، کە دەرفەتێکی لەباری بۆ ناوچە کورد نشینەکان رەخساند، کە سوودیان لەو تایبەت مەندیانەی بوەیهییەکان وەرگرت توانیان دەسەڵاتێکی کوردی لە چوارچیوەی سیستەمی میرنشین دابمەزرێنن.

---

١ - ابن الأثير، الكامل، ج٧، ص٢٧٤.

# بەشی سێیەم

## هۆکارەکانی رووخانی میرنشینەکان

### تەوەرەی یەکەم /هۆکارە ناوخۆییەکان

- ململانێی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات
- پشت بەستن بە هێزە دەرەکییەکان بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشە ناوخۆییەکان
- نەبوونی گیانی یەکگرتووخوازی لە نێوان میرنشینەکان دا
- کردارو رەفتاری هەندێ لە میرە کوردەکان
- عەقڵیەتی خێڵایەتی
- سیستەمی پشتاو پشت

### تەوەرەی دووەم /هۆکارە دەرەکییەکان

- دەرکەوتنی سەلجوقییەکان و پەیرەوکردنی سیاسەتی مەرکەزی
- شەڕو ململانێی میرنشینەکان لەگەڵ هێزە هاوسنوورەکانیان

## تەوەرەی یەکەم/هۆکارە ناوخۆییەکان

### ١- ململانێی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات

یەکێك لە فاکتەرە هەرە سەرەکییەکانی رووخان و هەرەسهێنانی میرنشینەکان بریتییە لە شەڕ و ململانێیە ناوخۆییەکان کە لە مێژووی کورد دا زۆر بەدیدەکرێت، جەنگ لە دونیای دەسەڵاتی کوردیدا بۆتە خەسڵەتێ لە خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەکان و قووڵ بە هەناوی کۆمەڵگادا ڕۆچووە و ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە، بووە بە کولتوور و ئیرادەی سیاسی پێ دەوردراوە مێژوویەکی بەرهەم هێناوە،کە پڕە لە خۆخۆری و خۆکوژی.

هەروەکو (العمري) ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت(( کوردەکان خەڵکێکی زۆرن لە ژمارە نایەن، لەبەر ئەوەی ئاگری دووبەرەکی و ئاشووبیان لە نێواندایە بۆیە هەر هەستانەوەیەکیان هەبێ دووبەرەکی دەیبڕێتەوە، ئەگەر وانەبوونایە دەستیان بەسەر وڵاتان دادەگرت ناوچەکانی دەوروپشتیان دەخستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەڵام بۆچوونیان جیاوازە و قسەشیان یەکانگیرنییە و بەردەوام دەستیان دەچێتە خوێنی یەکترەوە، تەنها یەك سەرکردەیان نییە چاوی ئافرەتەکانیان بە فرمێسکی خوێناوییە))[1].

لە ڕاستیدا مێژوو ئەم وتە و قسەنەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە زۆربەی میرنشینەکاندا ئەمە بەرجەستە دەکرێت کە جەنگی ناوخۆیی بۆتە سیمای هەڵوەشانەوەی پێکهاتەی جەستەی میرنشین، وەك دەبینین لە میرنشینی حەسنەویهی ویستی دەسەڵات جێگەی سۆزی نێوان کوڕ و باوکایەتی دەگرێتەوە هەستی خۆشەویستی دادەمارێت و بەرەو ئاقاری شەڕو ململانێیان دەبات لە پێناو گرتنە دەستی دەسەڵات و مانەوە لە فەرمانڕەوایی، ئەوەتە کاتێك میر(بدر کوڕی حسنویە) لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠٠٩ز) دا،(هەلال)ی کوڕی لە خۆی دووردەخاتەوە دەیکات بە فەرمانڕەوای

---

١- التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق، محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٨٨م، ص٥٨.

(الـصامغان) سـەرئەنجام (هـلال)لـەپێناو فـراوان کردنـی دەسـەڵاتی هێـرش دەکاتە سەر (ابن الماضی) فەرمانڕەوایی شارەزور کـە نوێنـەری بـاوکی بـوو لەم ناوچەیەدا[1] لەگەڵ ئەوەی کە (بدر) بەرهەڵستی کردو هەوڵیدا پێشبگیری بکات لە بەرامبەریدا.

بەڵام (هلال) گوێی پێنەدا دواجار هەڵسا بەکوشتنی (ابـن الماضـی) و بنەماڵەکـەی و دەسـتی بەسـەر سـەروەت و سـامانیاندا گـرت[2]. ئـەو کـارە بارودۆخەکەی خراپتر کردو بووە هۆی پەرەسەندنی شەڕو بەرپابوونی جەنگ لە نێوان (بدر)ی باوك (هلال)ی کوڕ کە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت بە هۆی سەخاوەتی لـە رێگـای کەسب کردنـی لایـەنگرانی بـاوکی بەسـەروەت و سامان، بەوە هاوکێشەی شەڕەکان بەلای (هـلال) کەوتـەوەو (بـدر) شکستی خوارد و دەستگیر کرا[3].

بێگومـان ئـەم ململانـێ و نـاکۆکی و ناتەباییـە ناوخۆییـە هێـزی میرنشینەکەی بەرەو پووکانەوە برد لە ئەنجامی تاك ویستی و تاك دەسەڵاتی و یـەکتر قبـووڵ نـەکردن، هـەر بۆیـە (بدلیـسی) لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: ((کوردەکان ئاکارێکی ناپەسندیان هـەبووە، کـە کەسـیان سـەر بـۆ کەسـیان ناچـەمێنێ و بـۆ یـەکتری ناسـەلمێنن هـەر کەسـە بـیر لـە سـەربەرزی خـۆی دەکاتەوە، بەتێکڕا بیر لەسەربڵندی تێکڕایی ناکـەن و پـشتی یـەکتر نـاگرن و نابنە یەك))[4].

مەسـەلەی پـاوانکردنی دەسـەڵات شـەڕکردن لـە پێنـاو گەیـشتن بـە دەسەڵات دیاردەیەکـە کـە میرنـشینە کوردەکـان پێـوەی گـیرۆدە بـوون، تـا

---

١- ابن الأثیر، الکامل، جـ٧، ص٥٦٣. محمد امین زکي، الدول و الأمارات الکردیة، ص٧٨.

٢ - ابن الأثیر، م. ن، جـ٧، ص٥٦٤. ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص١٠٩٨.

٣ - ابن الأثیر الکامل، جـ٧، ص٥٦٤. ابن خلـدون، العـبر، جــ٨، ١٠٩٨. حـسام الـدین النقـشبندي، الکرد فی الدینور و شهر زور، ص١٧٤، محمد جمیل رۆژ بیـانی مێـژووی حەسـنەوەیهی و عەییاری، ل٧٥.

٤ - شەرەفخانی بدلیسی، س. پ، ل٢٧.

ڕادەیەك كە لە زۆربەی میرنشینەكان بەرجەستە دەكرا.

لە میرنشینی عەنازییدا تا گەیشتنی هێزی بێگانە بۆ سەر وڵاتەكەیان بەردەوام میرەكانیان و بنەماڵەی دەسەڵاتدار خەریكی خۆكوژی و یەكتر كوشتن بوون لە ساڵی (٤٣١ك/١٠٣٩ز)دا شەڕێكی توند لەنێوان (ابو الشوك) و(المهلهل) ی برای بەرپابوو دەستپێكی شەڕەكەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە (ابو الفتح) نوێنەری (ابو الشوك) ی باوكی بوو، لە دەینەوەر دەستدرێژی دەكاتە سەر قەڵایەكی كوردەكان، (ابن الأثیر) دەڵێ: ((فەرمانڕواكەی ژنێك بوو))[١]، بەڵام (ابن خلدون) پێیوایە فەرمانڕەواكەی ئامادە نەبوو، خێزانەكەی پەنای بردە بەر (المهلهل) داوای یارمەتی لێكرد، بۆیە ڕووبەڕووی (ابو الفتح)ی برازای بۆوە دەستگیری كرد و خستیە زیندانەوە[٢].

لە كاتێكدا كە ئەو هەواڵە بە (ابو الشوك) دەگات سوپایەك ئامادە دەكات بۆ بەرهەڵستیكردنی (المهلهل)ی برای و بەرەو شارەزور چوو و گەمارۆیدا بە مەبەستی ئازادكردنی كوڕەكەی، بەڵام لەم كارەدا سەركەوتوو نەبوو[٣]، سەرئەنجام (ابو الفتح) لە زیندان مایەوە تا گیانی لەدەستدا[٤].

لە بەدبەختی كورد میرو دەسەڵاتدارانی ئەوەندە ویستی دەسەڵات و تاك ڕەوی و خۆسەپاندنیان هەبووە، هەركاتێك دەرفەتێكیان بۆ هەڵكەوتبووایە هەوڵی فراوان خوازیان دەدا، بە هەر جۆرو شێوازێك بوایە، دەبینین كاتێك (ابو الشوك) بەرەو داقوق دەچێ و گەمارۆی دەدا و بەهێز دەستی بەسەر دادەگرێت و تاڵانی دەكات، لەم كات و ساتەدا (سرخاب كوڕی

---

١- ابن الأثیر، الكامل، جـ ٧، ص٧٩٥.

٢ - العبر، جـ٨، ص١١٠٢

٣- ابن ألأثیر، الكامل، جـ٧، ص ٧٩٦ ـ ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص١١٠٢.

٤ - ابن الأثیر، م.ن، جـ٨، ص ٥٣. ابن خلدون، م. ن، جـ٨، ص ١١٠٥. محمد امین زكي، الدول و الأمارات الكردیة، ص١٢٩. حسین حزنی، اوریكی پاشەوە، ل٢٤.

محمـد)ی بـرای هێرشـی هێنایـە سـەر بەشـێك لەناوچـەكانی ژێـر دەسـەڵاتی ناچاری كرد كە لەو شارە پاشەكشە بكات[١].

لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٥ز)دا (ابو الشوك) دەمرێت[٢]و، بۆیـە (المهلـهل)ی برای شوێنی دەگرێتەوە و دەست دەگرێت بەسەر وڵاتـدا، بـەڵام (سـعدی بـن ابـی الـشوك) بـرازای ڕازی نابێـت بەمـە داوای مـیرات و میراتگـری بـاوكی دەكات[٣]. بۆیە چـەندین شـەڕو كوشـتار و تاڵانكـاری لـەنێوانیان ڕوو دەدات، جگـە لـە بەرژەوەنـدی تەسـكی تایبـەتی خۆیـان كـە لـە سـەرووی هـەموو ویستەكان بوو هیچ پرۆژەو مەبەستێكی گشتگیریان نـەبوو، لـە پێنـاو دابـین كردنی داخوازی گشتی خەڵك.

لەگەڵ ئەوەی كێشە ناوخۆییەكان لـە میرنـشینێك بـۆ میرنـشینێكی تـر جیـاوازی هـەبوو لـە هەنـدێكیان زۆر لـە كـەمێكیان كـەمتر بەدیـدەكرا، بـەڵام بەشێوەیەكی گشتی میرنشینێكی كوردیمان نەبینی كە شـەڕو ململانێـی تێـدا ڕوونەدابێت لەسەر دەسەڵات.

لـە بنەماڵـەی شەدادیـشدا كـە فـەرمانڕەوای میرنـشینێكی كـورد بـوون (مرزبـان كـوڕی محمـد) دوابـەدوای ئـەوەی كـە دەسـەڵاتی وەرگـرت لەلایـەن (فضلون) ی برایەوە ڕووبەڕووی بەرهەڵستی بۆوە، تا لە دەرفەتێكدا نـاوبراو توانی (مزربان)ی بـرای بكوژێـت و خـۆی بووبـە فـەرمانڕەوا[٤]. هـیچ گومـانی تێدانییە كاتێك دەسەڵاتێك لەناوخۆی ململانێـی هـەبێت، ناتوانـێ بـەگوێرەی پێویست بەربەست لە بەردەم مەترسییە دەرەكییەكاندا بنێت.

بەهەمان شێوە میرنشینی ڕەوادیش لەم كێـشە ناوخۆیـە بـەدەر نـەبوو وەكو نووسەری كتابی (الباب والأبواب) ئامـاژەی پێـدەكات لـە كاتێكـدا (ابـو الهیجاء محمـد كـوڕی حـسین) ڕەوادی دوای بـاوكی دەسـەڵات وەردەگرێـت و

١ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٢١. ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص١١٠٣.

٢ - بدليسي، س. پ، ل٣٩. زامباور، م. س، ص٣٢١.

٣ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٥٦. ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص ١١٠٥.

٤ - احمد كسروی، م. س، ص٢٦٩. اسماعیل شكر، م. س، ص٧٤.

پێگەی فەرمانڕەوای فراوان دەبێت ناوچەیەکی زۆر دەخاتە ژێر دەسەڵاتی، بەڵام براکەی بەناوی (مرزبان) دژایەتی لەگەڵ دەکاتدا، بۆیە (ابو الهیجاء) ڕووبەڕووی دەبێتەوە بەسەری زاڵ دەبێت و دەستگیری دەکات[1].

بێگومان ئەگەر ئەم کوشتن و کوشتارە ناوخۆییەی نێوان براکان نەبووایە لەسەر فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی میرنشینەکان بەهێزتر و پتەوتر دەبوو، بەڵام ئەو دیاردەیە هۆکارێکی کاریگەر بوو بۆ بێ هێزی و لاوازی میرەکان و دواجار بەرەو ڕووخانی بردن.

له میرنشینی هەزبانی ئەم ناکۆکی و ناتەبای و ئارەزووی گرتنەدەستی دەسەڵات زۆر بەدی دەکرێت، دەبینین کاتێك (عیسی کوڕی موسی)ی هەزبانی که فەرمانڕەوایی هەولێر بووە و بۆ ڕاو دەردەچێت، بەڵام لەلایەن برازاکەی[2] پیلانی بۆ دادەڕێژرێ و دەکوژرێ و خۆی بەرەو قەڵای هەولێر دەچێت و دەستی بەسەر دادەگرێت، و دەبێت بەفەرمانڕەوا، بەڵام دەسەڵاتی درێژخایەن نابێت، بەڵکو (ابوالحسن سلار کوڕی موسی) برای (عیسی)ی کوژراو دەبێتەوە فەرمانڕەوای هەولێر[3] بەڵام تەنها یەك ساڵ دەسەڵاتدار بوو کێشەو ململانێی لەگەڵ کوڕە مامەکەی (ابو الحسن کوڕی موسك) ی هەزبانی هەبوو، بۆیە سەردەمی فەرمانڕەوایی کورت خایەن بوو[4].

---

١ - مینورسکی، تاریخ قفقاز، ص٢٤٢ که له مێژووی ( الباب والابواب) وەری گرتووە وحسام الدین النقشبندي له اذربیجان ئاماژەی پێداوە، ص١٤٥.

٢- لەسەرچاوە مێژووییەکان ناوی ئەم کەسایەتیە نەهاتووە تەنها بە (کوری برا) ئاماژەی پێکراوە.

٣- ابن الأثیر، الکامل، جـ٨، ص٥٤. ابن ابی الهیجاء، تاریخ ابن ابی الهیجاء، طبع مع تاریخ القضاعي (ت ٤٥٤ هـ/١٠٦٢م) تحقیق، حمد فرید المزیدي، دار الکتاب العملیة، بیروت ٢٠٠٤، ص ١٩١

٤- ابن ابي الهیجاء، م. ن، ص١٩١.

دەسەڵات خوازی وای لە سەرکردە کوردەکان کردبوو کە کوشتنی براو مام و برازا بەلایانەوە شتێکی زۆر ئاسایی بێت، تەنها لە پێناو وەرگرتنی کورسی فەرمانڕەوایی و درێژەدان بە تاك ڕەوی خۆیان.

لە مێژووی میرنشینی مەروانیدا، لە ڕووی ململانێ و تەنگژە ناوخۆییەکان تارادەیەك جیاوازی بەدی دەکرێ، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو بارگرژییە ناوەکییەی کە پێگەی سیاسی ئەم میرنشینەی لەرزۆك کردبوو، تەنگی بە میرەکان هەڵچنیبوو کە ڕووبەڕووی پیلانی ناوخۆیی دەبوونەوە و دەکوژران لەلایەن چەند کەسێکی خود پەرستی دەسەڵات ویست، کراون بە ئامانج بۆ ئەوەی بتوانن جێگاو پێگەی خۆیان بسەپێنن.

میر(ابو علی الحسن کوڕی مروان) یەکێك بوو لەو میرانەی کە لە دیاربەکر بە پیلانێکی ناوخۆیی کوژرا[1]، بەهەمان شێوە میر (ممهد الدولە) دوابەدوای ئەوەی بە پیلانێك بانگەشەی قەڵای (هیتاخ)[2] کرا لەلایەن یەکێك لە بەرپرسان و هاوکارانی خۆی بە ناوی (شروە کوڕی مم) بە هاوکاری دارودەستەکەی هێرشی کرایە سەرو کوژرا[3].

بێگومان کوشتنی فەرمانڕەوایانی وڵات تەنگژەی ناوخۆ دروست دەکات و کاریگەری لەسەر ڕەوتی سیاسی هەیە، جگە لەوەش ناکۆکی نێوان میر (نظام الدین) ی مەروانی لەگەڵ (سعید)ی برای لەسەر دەسەڵات کاریگەری خراپی لەسەر ئایندەی میرنشینەکە هەبووە[4].

رووخانی میرنشینە کوردیەکان بە پلە یەك دەگەڕێتەوە بۆ کێشەو ململانێیە ناوخۆییەکان، کە نەبوونی سەقام گیری سیاسی مەرکەزی

---

١ - ابن شداد، م. س، جـ٣، ق١، ص٣٢٩. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص٧٣. ابو الفدا، المختصر فی اخبار البشر، جـ٢، ص ١٢٦-١٢٧. ابن الوردي، م. س، جـ١، ص٤٦٤.

٢ - هیتاخ، قەلایەکی سەختە لەدیاربەکر نزیك میافارقین. یاقوت الحموي، م. س، ج٥، ص٣٩٢

٣- الفارقي، م. س، ص٩٠. ابن شداد، م. س، جـ٣، ق١، ص٢٣٨ — ٣٣٩.

٤- الفارقي، م.ن ، ص١٨٠-١٨١. ابن شداد، م. ن، ج٣، ق١، ص٣٦٧.

دەسەڵاتی لاواز کردبوو، چونکە هیچ دەسەڵاتێك بەبێ تەبایی و یەکگرتووی و یەك هەڵوێستی ئەستەمە درێژە بە مانەوەی خۆی بدات و بتوانێت پارێزگاری لــە ســنووری هەرێمایــەتی بکــات و ڕووبــەڕووی هەڕەشــەو مەترســییە دەرەکییەکان بێتەوە.

## ٢- پشتبەستن بە هێزە دەرەکییەکان بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشە ناوخۆییەکان

کاراترین دیاردەی شەڕی ناوخۆ و ململانێی لەسـەر دەسـەڵات بریتییـە لـە دەسـتگرتنی هێـزی بێگانـە و هێنـانی هێـزی دەرەکـی بـۆ سـەر خـاك و نیشتمان بە مەبەستی لێدان و زاڵبوون بەسەر هێزی نەیاری هاونیشتیمانی و هاونەتەوەیی خۆیان[1] تەنها لـە پێنـاو پاراسـتن و بـەدیهێنانی بەرژەوەندییـە تایبەتییـەکان و وەرگرتنـی پیگـەو جێگـەی فـەرمانڕەوایی، کـە یەکێکـە لـە دیارترین و بەرچاوترین ئەو کرداروڕەفتارانـەی لـە مێـژووی کـورد دا بـوونی هەیە میرنشینەکان پێوەی گیرۆدە بوون.

لە میرنشینی حەسنەویهیدا دەبینین لە ئەنجامی دەستگیرکردنی (بدر) لەلایەن (هلال)ی کوڕی، کە لە یەکێك لە قەڵاکاندا دەست بەسـەر کرابـوو، لـە پێناو گێڕانـەوەی هاوسـەنگی هێـز و بەدەسـت هێنانـەوەی دەسـەڵات (بـدر) نامەی بۆ (بهاء الدولة)ی بوەیهی نارد تا لە وەرگرتنەوەی دەسەڵات یارمـەتی بدات[2]، بۆ ئەو مەبەستە ناوبراو سوپایەکی ئامادەکرد بە سەرکردایەتی (فخر الملك ابـو غالـب)ی وەزیـری، ئـەم لەشـکرە گەیشتە ناوچـەی سابورخواسـت

---

١- تیبنی، ئەم دیاردەیە لە قۆناغە مێژووییەکانی کوردا دا زۆر دووبارە بۆتەوە بـی ئـەوەی سـوود لـە دەرئەنجامـەکانی وەربگـرن، لەسـەر دەمـی عوسمانیـدا میرنـشینە کوردییـەکان هەندێکیان بەپاڵپشتی فارس و هەندێکیان بە هاوکاری تورك شەری یەکتریان کـردوە، و تائێستاش سەرکردەکانی کورد بەهەمان عەقلیەت حوکم دەکەن بەبێ ئـەوەی ڕەچاوی بەژەوەندی میللەتەکەیان بکەن و پەند لە مێژووی خۆیان وەربگرن.

٢ - ابن الأثير، الكامل، جـ٧، ص ٥٦٤ — ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص١٠٩٩.

کاتێك (هلال) هەستی بەوە کرد کە ناتوانێ بەرهەڵستی بکات بۆیە ئامادەیی خۆی پێشاندا کە گوێڕایەڵی بکات، ملکەچی فەرمانەکانی بێت. (فخر الملك) بەم پێشنیارە ڕازی بوو، بەڵام کێشەو ناکۆکییەکانی نێوان کوردان ئەوەندە بە قووڵی ڕۆچووە، لە ناخو دەروونیان تەشەنەی کردبوو و گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە (بدر) ئەو پێشنیازەی قبوڵ نەکرد، سور بوو لەسەر لێدانی کوڕەکەی سەرئەنجام (فخر الملك) لە شەڕێکدا توانی (هلال) دەستگیر بکات[1].

بێگومان هاتنی هێزی بوەیهییەکان بۆ سەر وڵاتی کورد ئاسەواری خراپی لەسەر پێکهاتەی قەوارەی حسنەویهییەکان هەبوو، لە دڵسۆزیان نەبوو بۆ (بدر) لە پێناو ڕزگار کردنی میرنشینەکە لە قەیرانی شەڕو ململانێی ناوخۆیی، بەڵکو کۆمەڵێك بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ڕەچاو کردووە، وەك دەبینین کاتێك (هلال) یان دەستگیر کرد دەستیان بەسەر قەڵاکەی داگرت بڕێکی یەکجار زۆر پارەو زێڕیان بەتاڵان برد.

کە ئەوەش کاریگەری خراپی لەسەر ئایندەی میرنشینەکان هەبووە، جگە لەوەی ڕێگە خۆشکەرێکە بۆ دەستێوەردان لە کاروباری میرنشینەکان و هەرکاتێك هێزێکیان بەدڵ نەبوایە، پاڵپشتی کەسایەتییەکیان دەکرد و یارمەتیان دەدا بۆئەوەی بەرهەڵستی نەیارەکانیانی پێبکەن. هەر وەك بەکارهێنانی (طاهر کوری هلال) و کۆمەك کردنی دژ بە (ابو الفتح)ی عەنازیی نموونەی ئەم بابەتەن[2].

بەم جۆرە میرانی کورد هەر بەهێزی خۆیان هەڵوەستەیان نەدەکرد، پێش هێزی بێگانە دەکەوتن بۆ کاولکردنی وڵاتەکەیان، برا لەگەڵ برا نەدەگونجا، بێگانەیان پێ باشتر بوو لە یەکتری، هەندێکجار بەشێك لە

١ - ابن الأثير، م. ن، جـ٧، ص٥٦٥. ابن خلدون، م.ن ، جـ٧، ص ١٠٩٩.

٢ - ابن الأثير، م. ن، جـ٧، ص١٠٨.

نیشتیمانەکەیان دەخستە بەردەستی بێگانە تەنها لە پێناو شکست پێهێنانی برایە فەرمانڕەواکەی.

ئەگەر سەرنج بدەین لە میرنشینی عەنازییدا کاتێك (المهلهل) هێرشی دەکرێتە سەر لەلایەن (ابو الشوك)ی برای پەنا دەباتە بەر (علاو الدوله کوڕی کاکویه) داوای کۆمەکی لێدەکات، ناوبراو بە خۆشحاڵییەوە ڕازی دەبێت و هێرشی بردە سەر(ابو الشوك) و دەستی بەسەر شارەکانی دەینەوەر و شارەزوور داگرت و لەگەڵ خەڵکەکە ڕەفتاری خراپ بوو زوڵم و ستەمی زۆری لێکردن[1].

بە هەمان شێوە (سرخاب کوڕی محمد) هاوپەیمانی لەگەڵ (ابو الفتح کوڕی ورام) ی گاوانی بەست بە مەبەستی هێرش کردنە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (ابو الشوك)، بۆیە ئەویش داوای یارمەتی لە (جلال الدوله) ی بوەیهی دەکات تا کۆمەکی بکات و یارمەتی بدات لە دژایەتی کردنی برایەکانی، ناوبراو سوپایەکی نارد بۆ هاوکاری کردنی[2].

لە مێژووی میرنشینی عەنازییدا ئەوەندەی دژایەتی و شەڕو ململانێیان ئەنجامداوە ئەوەندە دۆست و تەبا و هاوکار نەبوونە لە کاتێك (المهلهل) دەبێتە فەرمانڕەوای ئەم میرنشینە (سعدی) برازای خۆی دایەپاڵ (ابراهیم ینال) ی برای (طغرلبك)ی سوڵتانی سەلجوقی بۆ ئەوەی پاڵپشتی بکات و ولات لە ژێر دەسەلاتی مامی دەربهێنێ[3].

هێزە دەرەکییەکان هەموو کات لە دەرفەتێك دەگەڕان بۆ ئەوەی دەسەلاتیان فراوان بکەن میرنشینە کوردیەکانی دەوروبەریان لاواز بکەن و هیچ کاتێك ئەو توانایەیان نە بێت، کە دژایەتیان بکەن، لەسەر ئەم بنەمایە (ینال) یارمەتیدا و هێرشی هێنایە سەر شاری حولوان و داگیری کرد و وتاری

---

١ - م. ن، جـ٧، ص٧٩٦.

٢ - ابن الأثير، م.ن ، جـ٨، ص٢١. ابن خلدون، م. س، جـ٨، ص١١٠٣.

٣ - ابن الأثير، م. ن ، جـ٨، ص٥٦. ابن خلدون، م. ن، جـ٨، ص١١٠٥. مستەفا جەواد، عێلی جاوان، وەرگێرانی جمیل رۆژبەیانی، دەزگای چاپ بەخشی سەردەم، سلیمانی ٢٠٠١، ل٢٦.

هـەینیان بـە نـاوی (ینـال) خوێنـدەوە[1]، ئەمـەش مانـای لـە دەسـتدانی سەربەخۆیی ئـەم ناوچـەیە دەگەیـەنێ لەگـەڵ ئـەوەش (المهلهل) شـارەکەی رزگار کردەوە، بەڵام نەیتوانی بـە بـەردەوامی بـەرگری لـێ بکـات گوێڕایـەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان راگەیاند[2].

میرانی کورد ئەوەندە بۆ هێزی بێگانە نزمیـان نوانـدووە و بەرژەوەنـدیان دابـین دەکـردن ئەگـەر بـەم چەشـنە لـەناوخۆ بـۆ یـەکتری بیانکردایـە بێگومـان تووشی گرفتی ناکۆکی نەدەهاتن. (سعدی) هەر بەوەندە نەوەستا بـە پاڵپـشتی تورکەکان هێرشی بردە سەر (سرخاب)ی مـامی و هـەموو مـاڵ و سـامانی تـاڵان کرد کۆمەڵێك سەربازی نارد بۆ بندنیجین[3] (مەندەلی) دەستیان بەسەر داگرت و جێگرەکانی مامی دەستگیرکرد، ئەو هێزە تورکەی کە لەگەڵی هاتبوون تاڵانێکی زۆریان کردو دەستیان بەسەر برێکی زۆر لەمـەڕ و مـاڵات و سـەروەت و سـامانی خەلك داگرت[4].

پاشان (سعدی) ناوچەی مەندەلی بەخشی بە (ابو الفتح کـوڕی ورام) ی گاوانی لە برِی ئەوەی هاوکاری بکات و بەیەکەوە هێرش بکەنە سەر مامی لـە ئاکامـدا هـەردوو نـاوبراو لەلایـەن (سـرخاب) دەسـتگیرکران و سـوپاکانیان پێکهاتبوو لە تورك و کـورد، شکستیان خـــــــوارد بەناوچـەکەدا بڵاوەیـان کرد[5]، بەڵام لـە دواجـار لـە سـاڵی (٤٣٩ك/١٠٤٧ن) دا، کـوردە لورییـەکان (سـرخاب) یـان دەسـتگیر کـرد بـە هاوکـاری کۆمـەڵێك لەسـەربازانی خـۆی و

---

١ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٥٦-٥٧ ٦.

٢ - م. ن، جـ٨، ص٥٧.

٣ - البندنيجين، شارێکی بـە ناوبانگـە لـە رێگـای نـەهرەوان لـە نێـوان ولاتـی چیا و بەغدا. (ئێستا بە مەندەلی ناودەبرێت) ياقوت الحموي، م. س، ج١، ص٤٩٩.

٤ - ابن ألأثير، الكامـل، جـ٨، ص٥٧. محمـد جـەمیل رۆژ بـەیانی، مێـژووی حەسـنەو یهی و عەییاری، ل ٢١٨.

٥ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨. ص٥٧.

وەناردیان بۆ لای (ابراهیم ینال)ی سەلجوقی ئەویش چاوێکی دەرهێنا و داوای لێکرد کە (سعدی) ئازاد بکات[1].

بەم چەشنە سەرانی کورد هەرکاتێك ناکۆکی و کێشەی ناوخۆییان هەبووایە پەنایان بۆ هێزی دەرەکی دەبرد یارمەتیان لێ وەردەگرت، جا باجەکەی بەهەر چەشنێك بوایە، ئامادە بوون بیدەن تەنها لەبەر سەر کێشی و بەدیهێنانی ئارەزووەکانیان بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات.

لە میرنشینی مەروانیشدا هاوشێوەی ئەوانی تر کاتێك کە کێشە لە نێوان دوو برا سەریهەڵدا بە هۆی گیرۆدەبوونیان بۆ دەسەڵات خوازی (سعید) لە دژی (نظام الدین)ی برای پەنا دەباتە بەر سوپای تورك داوا لە سوڵتان (طغرلبك) دەکات بۆ ئەوەی پاڵپشتی بکات و یارمەتی بدات، سەرئەنجام لەشکری تورك دەهێنێتە سەر وڵاتی مەروانی[2]، ئەوەی جێگەی لێ وردبوونەوەیە هەرکاتێك سەرکردەیەکی کورد داوای کۆمەکی لە هێزێزێکی بێگانە کردبێت، یەکسەر ئامادەیی خۆی پیشانداوە بۆ لێدانی نەیارێکی ناوخۆیی، بێگومان ئەوەش بێ بەرامبەر نەبووە، جگە لەوە لاوازی میرنشینە کوردییەکان راستەوخۆ بەهێزی ئەوانی دەگەیاند.

هۆکارێکی تر کە کاریگەری لەسەر هەرەسهێنانی میرنشینی مەروانی هەبوو، پشتبەستن و بەکارهێنانی هەندێك کەسایەتی (دیان) بوو لە کۆکردنەوەی (باج و خراج) لە دانیشتوان[3] رەنگە ئەمەش نارەزایی لەلایەن خەڵکەوە دژبە دەسەڵاتی مەروانی دروست کردبێ، جگە لەوەش بەکارهێنانیان لەوپلەو پایە سیاسی و ئیدارییەکان بە گوێرەی وتەی (فارقي) پێدان و بەخشینی پلەی وەزیر بە (ابو سالم)ی پزیشك لە شوێنی وەزیرێکی موسلمان سیستەمی دەوڵەتی مەروانی بەرەو لەناو چوون برد[4].

---

١ – م. ن، جـ٨، ص٦٠.

٢ – م. ن، جـ٨، ص٦٠.

٣ - الفارقي، م. س، ص١٨٠ - ١٨١.

٤ - م. ن، ص٢٠٨. ابن شداد، م. س، جـ٣، ق١، ص٣٨٣.

لەوانەیە هەر ئەوە وای لە وەزیری پێشوو (فخرالدولە محمد بن جهیر) کردبێت، داوا لە سوڵتانی سەلجوقی (ملکشاه) بکات کە دەست بگرێت بەسەر وڵاتی مەروانیدا و سەرنجی ڕاکێشا بەرەو زۆری ئەو خێروبێرەی کە لەم ناوچەیەدا هەیە[1]، کە ئەوەش ڕێگا خۆشکەرێك و پاڵنەرێك بوو بۆ داگیرکردن و دەست بەسەر داگرتنی ئەو هەرێمە، بەڵام لە میرنشینی شەدادی و ڕەوادی دیاردەی دەست کێشی کردنی هێزی دەرەکی بۆیەکلایی کردنەوەی گرفتە ناوخۆییەکان بەدیناکرێت، هەر ئەوە نەبێت کە (ابن الأثیر) ئاماژەی پێدەکات لە ساڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز)دا سوڵتان(طغرلبك) بڕیار دەدات بەدانانی (مملان) لە شوێنی (وهسوذان کوڕی مملان)ی باوکی لەسەر ئازربیجان[2]، بەڵام ئاماژەی بە هۆکاری دەستنیشان کردنی نەکردووە ئایا (مملان) داوای لێکردووە، لە کاتێکدا باوکی لەم ساڵەدا هێشتا لە ژیاندا بوو[3].

میرەکانی هەزبانی لە هەولێر زۆر ناتەباو ناکۆك بوون لە زۆربەی کاتدا بۆ وەرگرتنی دەسەڵات پەنایان دەبرد بۆ هێزی دەرەکی، دوای کوشتنی (عیسی) ی فەرمانڕەوای هەولێر براکەی (ابوالحسن سلار کوڕی موسی) پەنادەباتە بەر (قرواش کوڕی المقلید) فەرمانڕەوای موصل، بەیەکەوە بەرەو هەولێر دێن و (سلار) دەسەڵات وەردەگرێت و قرواش بەرەو موصل دەگەڕێتەوە[4].

لە ساڵی (٤٤٠ك/ ١٠٤٨ ز)دا، (ابو علی کوڕی موسك) بە پاڵپشتی حەمیدییەکان حوکمڕانی هەولێر وەردەگرێت لە (ابو الحسن سلار)ی برای دوای دەست گیرکردنی، بەڵام (قرواش) پاش ئازاد کردنی بۆ جارێکی تر هەوڵدەدات (ابوالحسن) بکاتەوە بە حوکمرانی هەولێر[5].

---

١ - الفارقي، م. ن ، ص٢٠٨. ابن شداد، م. ن، جـ٣، ق١، ص٢٨٣.

٢ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص١٦٢.

٣ - مینورسكی، تاريخ قفقاز، ص٢٤٢ - حسام الدين النقشبندي، اذربيجان، ص١٧١.

٤- ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٥٤. ابن ابی الهيجاء، م. س، ص١٩١. ابو الفدا، المختصر، ج٢، ص١٦٨.

٥- ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٧١-٧٢. زبير بلال اسماعيل، اربيل، ص١٣٤-١٣٥.

بەلام دەبێت ئەوە بلێین دەست کێشی کردنی بێگانە، واتا رێگا خۆشکردن بۆی، هەرکاتێك بواری بۆ برەخسێ و دەرفەتی گونجاوی لەبەردەم بێت، دەبیت بەداگیرکەری ولات و رووخێنەری میرنشینەکان و ئەو قەوارە سیاسیيانەی کە بنیاتنراوە وەك لە دواتر بە شێوەیەکی کرداری بینیمان بەشێك لەو هێزانەی کە سەرانی کورد لە ململانێیە ناوخۆییەکان پشتیان پێبەستابوون، هەر ئەوان رۆڵی کارایان بینی لە هەرەس پێهێنانی میرنشینەکان.

### ٣- نەبوونی گیانی یەکگرتووخوازی لە نێوان میرنشینەکان

یەکێك لە هۆکارەکانی هەرەسهێنانی میرنشینە کوردییەکان بریتییە لە نەبوونی یەك هەڵوێستی و گیانی یەکگرتووخوازی لە نێوانیاندا، لەگەڵ یەکانگیری زمانی هاوبەش و کولتووری لە یەکچوو لە پێکهاتەی سەرجەم میرنشینەکان لە ناوچەو هەرێمە کورد نشینەکاندا، بەلام بەرژەوەندی جیا و بیرورا و ویستی جیا، کاریگەری لەسەر دامەزراوەی میرنشینەکان هەبوو، کە چەند عەقلیەتێکی سیاسی جیا بەرهەمی هێنابوو، نەیاندەتوانی بەیەك ئاراستە هەڵ بکەن و بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو هەنگاو بنێن ئەوەش خۆی لە خۆیدا لاوازی و بێهێزی لێدەکەوێتەوە.

جێگای گومان نییە دەوڵەت بە پاڵپشتی هێز دەمێنێتەوە، یەکگرتوویش هێز دەدات بە دەوڵەت، لەگەڵ ئەوەی هەلێکی گونجاو و لەبار بۆ هەڵکەوتەی میرنشینەکانی سەردەمی عەبباسی لە ئارادابوو، بەهۆی نزیکی پێگەی جوگرافییان لەگەڵ یەك و هاوسنووری هەندێکیان بەسەر یەکەوە، بەلام نەیانتوانیوە جۆرێك لە کۆنفدراسیۆن پێکبهێنن لە پێناو پتەو کردنی دەسەلاتیان و پارێزگاریکردنی لە هەر هەرەشەو مەترسییەکی دەرەکی ئەگەر رووبەروویان بێتەوە.

فەرمانرەوایی شەدادییەکان لە ئاران و هاوشانی میرنشینی رەوادییەکان لە ئازربیجان کە سنووریان بەیەکەوە هەڵکەوتبوو ناوچەیەکی بەرفراوانیان لە ژێر

دەسـەڵات دابـوو، بـەڵام هـیچ جـۆرە یـەکگرتوویی و یـەکبوونێکیان لـە نێوانـدا بەدیناکرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە ناکۆکی و ناتـەباییان لـە نێوانـدا هـەبووە. لـە ساڵی (٤٢٥ك/١٠٣٣ن)دا لەکاتی فەرمانڕەوایی میری شـەدادی (ابـو الحسن علـي الـشکري) دوژمنایـەتی و کێـشەو نـاکۆکی لەگـەڵ مـیری ڕەوادی (وهـسوذان) دا هەبووە[1].

لەگەڵ ئەوەی بە درێژایی مێژووی ئەم دوو میرنشینە پەیوەندییەکانیان گـۆڕانی بەسـەر داهـاتووە، بـەڵام هـیچ کاتێـك نـەیانتوانیوە دەسـەڵاتێکی یەکگرتوو بهێنـە ئـاراوە قەوارەیـەکی پتـەو دابمـەزرێنن و بەرهەڵـستی هێـزە مەترسیدارەکانی پێبکەن.

دەبێت دڵنیابین لەوەی کە پارێزگـاری کردنـی میرنـشین و دەوڵـەت بـە پلەی یەك بە یەکگرتوویی و سەقامگیری ناوخۆیی دەکرێت، بۆیە بیرمەندێکی وەك (ویل دیورانت) دەڵێ: ((ئەوەندە بەسە دەوڵەت بەو پێناسە یـە بناسـین کە بریتییە لە ئاشتییەکی ناوخۆیی بە مەبەستی ئامادە باشـی بـۆ جـەنگێکی دەرەکی))[2].

لەڕاستیدا نەبوونی ئەم ئاشتییە ناوخۆییە وایکردووە دەسەڵاتی کوردی نەتوانێت درێژە بەمانـەوەی خۆیـان بـدەن، لـە میرنـشینی عـەنازیی لـە بـڕی دامەزراندنی پەیوەندی پتەو لەگەڵ حەسنەویهییەکان بەردەوام کیـشەو شـەڕ و ناکۆکییان هەبوو، لەسەر فراوان خوازی لە سـاڵی (٤٠٠ك/ ١٠٠٩ ن) دا، (ابـو الفتح کوڕی عنان) هێرش دەکاتە سەر میرنشینی حسنەویهی دەست دەگرێـت بەسـەر قرمیـسین (کرماشـان) لـە ژێـر دەسـەڵاتی (هـلال کـوڕی بـدر) دەری دەهێنێ و دەیکات بە بەشێك لە موڵکی خۆی[3].

---

١ - احمـد کـسروی، م. س، ص ٢٠٧ -٢٠٨. حـسام الـدین النقـشبندي، اذربیجـان، ص ١٦٥ - ١٦٦. اسماعیل شکر، م. س، ص٧٧.

٢- مێـژووی شارسـتانێت، و/ کۆمـەڵێك وەرگێـر، بـەرگی یەگـەم چاپی کـوردی، چاپخانەی پەخشی سەردەم، سلیمانی ٢٠٠٧، ل٦٩.

٣ - ابن الأثیر، الکامل، جـ٧، ص٥٦٤. ابن خلدون، العبر، ج٨، ص١٠٩٨.

بەگشتی پەیوەندی نێوان ئەم دوو قەوارە کوردییە بریتی بووە لە جەنگ و خوێن ڕشتن، پەیوەندییەکی ناتەندروست و ناجێگیریان هەبوو، تاکۆتایی هاتنی حسنەوەیهییەکانیش ململانێیان بەردەوام بوو، دوا میری ئەو میرنشینە (طاهر کوری هلال) شکستێکی گەورەی بە (ابو الشوك) ی عەنازیی هێنا لە شەڕێکدا برایەکەی بە ناوی (سعدی) کوشت، بۆ جاری دووەم (ابو الشوك)لە بەرامبەریدا شکستی خوارد، دواجار پەیوەندی نێوانیان بەرەو ئاشت بوونەوە چوو، بەڵام ئەم ئاشت بوونەوەیە لەسەر بنەمای راست و دروست نەبوو، بەڵکو بە نیازێکی خراپ و پیلانێکی ژێربەژێری بوو کە ئاکامەکەی کوشتنی (طاهر کوری هلال)لێکەوتەوە لەلایەن (ابو الشوك) ی عەنازیی لە تۆڵەی برایە کوژراوەکەی[1].

پێویستە ئەوە بڵێین میرنشینە کوردییەکان لەناو خودی بنەماڵەی دەسەڵاتدار لە پێکهاتەی میرنشینەکەدا لەگەڵ یەکتری تەباو یەکگرتوو نەبوونە جا چۆن ئەم هەڵوێست و ئیرادەیان بۆ دروست بێت لە نێوان سەرجەم میرنشینەکاندا گیانی دۆستایەتی و هەماهەنگی و هاوکارییان بۆ بنیات بنرێ.

لەبارەی ئەو ئاکارە نالەبارەیان (سەعدەدین)[2] لەناو مێژووە تورکییەکەیدا کە بۆ عوسمانی داناوە، سەبارەت بەکوردیش دواوە و دەڵێ: (( هەموو کوردێك بۆخۆی سەربەخۆییەکەو ئاڵای ملهوڕی و زۆرداری بەرز کردۆتەوە و لەناو ئەو شاخ و کێوانەدا بەسەربەستی دەژین، ئەگەر سەرنج بدەیە باری یەکدیگیری و هاوبیری و هاوکارییانەوە تەنها لە شادەو ئیماندا نەبێ لە هیچ شتی تردا یەکتر ناگرنەوە))[3].

---

١- ابن الأثیر، م. ن، جـ٧، ص ٦٠٨. ابن خلدون، م. ن، ج٨، ص١١٠١

٢ (خواجە سعدەدین کوڕی حوسێن)ە دانەری کتێبی تاج التواریخ –کە بەخواجە تاریخی بەناوبانگە، لەساڵی (٩٧٢ك/١٥٦٤ز)دا ماموستای سوڵتان مرادخان بووە، بروانە پەراوێزی لاپەرە(٢٧) شەرەفنامە بەدەستی (علی عونی.)

٣ - شەرەفخانی بدلیسی، س. پ، ل ل٢٦-٢٧.

سەرەڕای ئەوەی کە میرنشینە کوردییەکان لەو ئاستەدا نەبوونە کە بیرۆکەی یەکگرتووخوازی پراکتیزە بکەن، هەندێك جار ئاراستەی پێچەوانەیان وەرگرتووە لەدژایەتی کردنی یەکتری دەستێکی بالآیان هەبووە، جگە لەوەش بە هۆی لاوازی عەقلیەتی سیاسی میرە کوردەکان ئەوەندە گوێڕایەڵییان بۆ هێزی نا کوردیەکان کردوە، بەقەد ئەوە لە نێوان خۆیان هاوکار و هاوڕا نەبوونە.

کاتێك (قرواش) ی عقیلی داوای یارمەتی لە هەزبانییەکان دەکات لە هەولێر بۆ لێدانی (نصر الدولە کوڕی مروان) میری هەزبانی (ابو علي) برایەکەی دەنێرێ بە مەبەستی کۆمەك کردنی عەقیلییەکان[1]، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەزبانییەکان وەك میرنشینێکی کوردی ئەوەندە هاوکاری و پاڵپشتیان بۆ میرنشینی عەقیلی عەرەبی هەبووە، بە پێچەوانەوە لەگەڵ مەڕوانییەکان دۆست و یەکگرتوو نەبوونە.

بە شێوەیەکی گشتی میرنشینە کوردییەکان نەیانتوانیوە جۆرێك لە گونجان و هاوبیری و یەکانگیری لە نێوان خۆیاندا دروست بکەن و سوود لە هاونیشتیمانی و هاونەتەوەیی وەربگرن دەسەلآتێکی پتەو بنیات بنێن و لەبەردەم مەترسی دەرەکی هاوکاری یەکتر بکەن، کاتی گەیشتنی هێزی بێگانە بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان میرنشینەکان چەند قەوارەیەکی پچڕپچڕی لە یەکدا بڕاو بوون هەریەکەو بە تەنها توانای بەرگری و بەرهەڵستی نەبوو.

## ٤- عەقلیەتی خێلآیەتی

کۆمەڵگەی کوردی پێکهاتەیەکی خێلآیەتی هەیە و سەرجەم میرنشینە کوردەکان لەسەر بنەمای خێلآیەتی بونیاتنراون وەکو باسمان

---

١- ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٧٢ - ابن خلدون، العبر، جـ ٧، ص ٥٦٣.

کرد، بەڵام شیکردنەوەو سەرنجدان بۆ خەسڵەت و پێکهاتەی واقیعی خێڵ کە پێکهاتەیەکی بەرتەسك و سنوورداری هەیە، لە چوارچێوەی عەقڵیەتی خێڵایەتی کە پڕە لە خۆویستی و قبووڵ نەکردنی خێڵی بەرامبەر لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی نەتەوەیی و هاونیشتیمانی و یەکدەگرنەوە، بەڵام دژایەتی و دوژمنایەتی یەکتر دەکەن لەسەر بنەمای خۆسەپاندن و فراوان خوازی و بەرفراوانکردنی سنووری جوگرافی.

بۆیە دەبینین بەرجەستە کردنی عەقڵیەتی خێڵ لە ناو کایە سیاسییەکان و بەردەوام بوونی لەناو میرنشین بەرەو ئاقاری ڕووخانی بردن، لەبەر ئەوەی هاوخێڵی بوون جێگای هاونیشتیمانی دەگرێتەوە دواجار بەرەو دوژمنایەتی نێوان خێڵەکان دەچێت، ئەم دیاردەیە لە ناو میرنشینە کوردییەکان بەدیدەکرا، وەك شەڕو ناکۆکی نێوان خێڵی بەرزیکانی و خێڵی شاذنجانی کە خاوەنی دوو میرنشینی کوردی جیا لە یەکتری بوون[1]، هەردوو دەسەڵاتی بەرەو لاوازی و پوکانەوە برد.

لەڕاستیدا جێبەجێ کردنی پرەنسیپەکانی عەشیرەتگەریەی ئەو هەلومەرجە دروست دەکات، هەرچی لە عەشیرەتی خۆیان نەبێت، ئەوە نەیارە و بێگانەیە سەبارەت بە هەلومەرجی میرنشینەکان کە لە پێناو سەلماندنی سەردەستەیی و دەسترۆیی و باڵا دەستی پەلاماری خێڵێکی تریان دەدا کە بە هەرشێوەیەك بێت ملی پێ کەچ بکەن و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

بەڵام پێویستە بۆ بەردەوامیدان بە دەسەڵات و بەرەو دەوڵەت چوون ئینتیمای خاك جێگای ئینتیمای خێڵ بگرێتەوە، وەك لەم بارەیەوە (فریدریك ئەنگلس) دەڵێ: ((یەکەمین هەنگاو هەوڵدان بۆ بنیاتنانی دەوڵەت بریتیە لە تێکشکاندنی بەندو بواری خێڵایەتی))[2].لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێین

١ - ابن الأثير، الكامل، جـ٧، ص٥٤٦ - ٥٤٧. فرست مرعي، م. س، ص٣٥٣.

٢ - بنەچەی خێزان و خاوەنداریەتی تایبەت و دەوڵەت، وەرگێرانی لە ئەلمانییەوە، کەریم مەلا رەشید، چاپخانەی تێشك (سلیمانی. ب. س)، ل ٢٠٧.

پەیڕەو کردنی بیرۆکەی خێڵگەری درێژەدانە بە دژایەتی و ناکۆکییەکان کە یەکنەگرتوویی و پەرتەوازەیی لێدەکەوێتەوە، کە دەرئەنجامەکەی هەرەسهێنان و ڕووخانە.

خەسڵەتێکی تر کە لە پێکهاتەی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بەرچاو دەکەوێت، کە بەڵگەیەکە لە پێنەگەیشتوویی و دیاردەیەکە بۆلە بارچوون، وەك لازاریف دەڵێ: ((خێڵە کوردییەکان لە هەستی بەرژەوەندی گشتییەوە دووربوون، ئەوانەی سەرۆکایەتی میرنشینەکانیان دەکرد، زۆر بە خێرایی دەکران و بە بەڵێن و قسەی شیرین هەڵدەخەڵەتان و بگرە لەگەڵ بێگانەکانیشدا ڕێك ئەکەوتن و خێراش ڕوویان لە بەرژەوەندی گشتی وەردەگێراو ئەیانکرد بە هی خۆیان و دوایش لەناو خۆیاندا دەکەوتنە شەڕو کوشتن))[1].

خێڵی هەزبانی لە جیاتی بەستنی پەیوەندی دۆستایەتی و هاوکاری کردنی یەکتری لەگەڵ خێڵی حەمیدی کوردی بەردەوام دەگەڕان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان و دەست تێوەردان لە کاروباری یەکتری و فراوان کردنی پێگەی خێڵایەتیان[2]، هەروەها هۆزی حەکەمی کوردی بەربەرەکانی و ململانێی هەزبانییەکانیان دەکرد، لەسەر فەرمانڕەوایی هەولێر[3] و پەیوەندی نێوان خێڵەکانیش لە زۆر حاڵەتدا لە ڕێگای نا هاوسەنگی هێزو توندو تیژییەوە چارەسەر دەکرا.

دەبینین مێژووی کورد تەنها مێژووی داگیرکردنی کوردستان نەبووە،یا مێژووی یاخیبوون و بەرانگار بوونەوەی داگیرکەران نەبووە، بەڵکو مێژووی شەڕی نێوان خێڵ و میرنشینەکانیشە، کە بەرهەمی گەشەکردنی دەسەڵاتی

---

١ - چەند کێشەیەکی دیموگرافی و مێژووی وسیاسی و پەیوەندی کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی کورد، و/کاوس قەفتان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراقی - دەستەی کورد، ب١٦ — ١٧. بەغدا ١٩٨٧، ل ٤٠٤.

٢ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٧١ -٧٢.

٣ - محسن محمد حسين، اربيل فى العهد الاتابكى، مطبعة اسعد — بغداد ١٩٧٦، ص٣٨.

خێڵێك، یان چەند خێڵێك بوون، بۆیە مێژووی كورد تا ڕادەیەكی زۆر بە مێژووی خێڵ و كولتوور و نەریتی خێڵایەتییەوە بەستراوەتەوە، لە سایەی سیستەمی دەرەبەگایەتی و پەیوەندییەكانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتیدا خێڵ و سیستەمی خێڵایەتی درێژەیان بە خۆیان داوە، كولتوورو پرەنسیپەكانی خۆیان بڵاو كردۆتەوە، ئاشكرایە خێڵ وەك یەكەیەكی كۆمەڵایەتی لە بنەڕەتدا لەسەر بناغەی هاوخوێنی،یان وەلائی هاوبەش و شێوەی ژیانی هاوبەش و هاو چارەنووسی ڕاگیراوە، كە ئەوەش وای كردووە كە تەنها ڕەچاوی بەرژەوەندییە بەرتەسكەكانی خۆیان بكەن، نەیانتوانیوە ئاشنایی و ئاشتەوایی لەگەڵ خێڵی بەرامبەر بنیاد بنێن، بەبێ گوێدانە جیاوازی خوێن، یاخود جۆرە گونجانێكی بنەڕەتی لە نێوان خێڵ و سیاسەتدا بهێننە ئاراوە درێژە بە دەسەڵاتیان بدەن.

## ٥ - كردارو ڕەفتاری هێندێ لە میرە كوردەكان

لەبەشی دووەمی ئەم باسەدا ئاماژەمان بە هەندێك لە میرە كوردەكاندا، كە ڕۆڵیان هەبووە لە دامەزراندنی میرنشینە كوردییەكان، بەڵام لێرەدا دەبێت ئەوە بگوترێت كە هەر سەركردەیە كاتێك بە ئەركەكانی خۆی هەڵناستێ و بەرژەوەندی خۆی دەخاتە سەرووی بەرژەوەندی میللەتەكەی هەندێك كردارو ڕەفتار ئەنجام دەدات، كە دەرئەنجامەكەی بێهێزی و لاوازی میرنشینەكەی لێدەكەوێتەوە، دەبینین هەندێ لە میرە كوردەكان خۆیان بە كاری لاوەكییەوە سەرقاڵ كردووە و كاروباری بەڕێوەبردنی میرنشینەكەیان فەرامۆش كردووە.

لە میرنشینی شەدادی هاتنی هەندێ میری بێ توانا وەك (مرزبان كوڕی محمد) كاریگەری خراپی لەسەر ڕەوتی سیاسی سەردەمەكەی هەبوو، لەو ئاستە نەبوو كە بەكارامەیی كاروبارەكانی بەڕێوەببات[1]. هەروەها یەكێك لە

---

١- احمد كسروی، م. س، ص٢٦٩

میرەکانی تر بە ناوی( فضلونی سێیەم) کە کاروباری میرنشینەکەی بەجێ هێشت و وازی لە دەسەلآت هێنا چووە سەر ئاینی مەسیحی، ڕووی کردە یەکێك لە کلێساکانی شاری ئانی[1]، ئەمەش کاریگەری لەسەر ڕەوتنی مێژووی ئەم میرنشینە هەبوو، بەرەو ئاقاری بێهێزی ئاراستەی کرد.

یەکێك لەو کردارانەی کە لە چەند میرێك بەدی دەکرا بریتی بوو لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بەکار هێنانی لە بەرژەوەندی و ئارەزووە تایبەتییەکانیان، دواتر بە فیڕۆدانی ئەو ماڵ و دارایییە بە دەر لە بەرژەوەندی گشتی، لە میرنشینی حسنەوەیهی (هلال) کاتێك کێشەی لەگەڵ (بدر)ی باوکی هەبوو هەوڵی دەدا لایەنگرانی باوکی لە ڕێگای پارەوە فریوبدات و بۆ لای خۆی ڕاکێشیان بکات[2].

یاخود هەندێ جار ئەو پارەی کە کۆکرابۆوە لەلایەن هێزی دەرەکییەوە دەستی بەسەر دادەگیرا، وەك ئەوەی بوەیهییەکان لەسالی(٣٦٩ك/٩٧٩ز)دا دەستیان بەسەر قەڵای سرماج داگرت و سەروەت وسامانی زۆری حەسنەوەیهییەکانیان برد[3]، هەروەها کاتێك (هلال) یان دەستگیر کرد و دەستیان بەسەر قەڵاکەیدا داگرت و بڕێکی یەکجار زۆر زێڕ و پارەو شتی گران بەهایان برد[4].

بێگومان بردنی ئەو سەروەت و سامانە کاریگەری لەسەر بێهێزی باری ئابووری میرنشینەکە هەبوو، و فاکتەرێکە بۆ لاوازی پەیوەندی نێوان خەڵك و دەسەلآت، لەبەر ئەوەی ئەم سەروەتە لە ڕێگای وەرگرتنی باج و سەرانەوە کۆکراوەتەوە، دواجار دەچێ بۆ خەزێنەی بێگانە. دەرئەنجامی هەموو ئەم کارانە دڵسۆزی و ئینتیمای تاك بۆ دەسەلآت کەم دەبێتەوە بەرەو دارمانی دەبات و توانای بەرهەڵستی هێزی دەرەکی نامێنێت، وەك (توماس) دەڵێ:

---

١ - م. ن، ص٣١٤. اسماعیل شكر، م. س، ص٧٤.

٢ - ابن الأثیر، الكامل، جـ٧، ص٥٦٤.

٣- الروذراوري، م. س، ج٦، ص١١- ابن الاثیر، الكامل، ج٧، ص٢٧٢

٤ - ابن الأثیر، الكامل، جـ٧، ص٥٦٥. ابن خلدون، العبر، جـ ٨، ص١٠٩٩.

((هیچ كۆمەڵگایەك بەبێ سەلماندنی ئامانجەكان و فەلسەفەی وجوودی خۆی بە تاكەكانی، ناتوانێت درێژە بە ژیانی بدات و گەشە بكات، خۆ ئەگەر نەیتوانی كارێكی وابكات مەشرووعییەتی خۆی لە دەست دەدا، بەواتایەكی دیكە ئەگەر دەسەڵات نەتوانێت بایەخ و گرنگی خۆی بە ئەندامەكانی كۆمەڵگا بسەلمێنێت، ناشتوانێت داوای وەفاداری و هاوكاری كردنیان لێبكات، ئیدی ناتوانێت لێبڕاوانە مەترسیە دەرەكییەكان لەناو ببات))[1].

دەقە مێژووییەكان ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەكەنەوە كە چەندە سەركردە بەتەنگ ئارەزوو و ویستە تایبەتییەكانی خۆیەوە بێ ئەوەندە گرنگی و متمانەی خۆی لە دەست دەدات لە میرنشینی مەروانی ئەم دیاردەیە بەرچاو دەكەوێت، كەمیر (نصرالدولە أحمد)ی مەروانی كە زۆربەی كات و ساتەكانی خۆی تەرخان كردبوو بۆ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی وەك (الذهبي) ئاماژەی پێدەكات و دەڵێت: ((سێ سەد و شێست جاریەی هەبوو هەر شەوە لای یەكێكی بەر دەكەوت[2]، تەنانەت لە كڕینی هەر جارییەك زیاتر لە پێنج سەد دیناری پێداوە جگە لە بەفیڕۆدانی سەدان هەزار دینار تەنها بۆ مەلەزات و خۆشگوزەرانی و دروستكردنی كۆشك و تەلار و شتی ڕووكەش لە پێناو ڕەفاهیەت و دڵخۆشی خۆی))[3].دیارە گرنگ دان و خەریك بوون بە ڕابواردن و سەرقاڵی بە ژیانی تایبەتی نا ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی فەرامۆش كردنی كاروباری سیاسی و بێ ئاگابوون لە بارودۆخ و بژێوی ژیانی خەڵك، ئەوەش كاریگەری خراپی لەسەر ڕەوتی بەڕێوەبردنی میرنشینەكە هەبوو.

(ابن خلدون) ئەم دیاردەیە بە فاكتەری سەرەكی دادەنێت بۆ ڕووخانی دەوڵەت، كە لەو ڕوانگەیەوە دەڵێت: ((كاتێك مەلیك و فەرمانڕەواكان زیادە

---

١- تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسییەكان، وەرگێڕانی، فەرشید شەریفی، چاپخانەی كاردۆخ، سلیمانی ٢٠٠٥، ل٦٤.

٢ - سیر اعلام النبلاء، اعتنی بە، محمد بن عیادی بن عبد الحلیم، مكتبة الصفا، القاهرة ٢٠٠٣، جـ ١١، ص ٥٧. ابن تغري بردي، م. س، جـ٤، ص٦٩.

٣ - ابن خلدون، العبر، جـ٧، ص٦٨٢.

ڕۆیی لە پێویستیەکانی ژیان دەکەن لە ڕەفاهیەت دەکەونە خۆشی و ڕابواردن و بە هەشتی ژین، ئەوسا دەبنە بارقورسی بەسەر دەوڵەت))[1] . هەر لەم بارەیەوە دەڵێ :((کاتێك سروشتی دەوڵەتداری مل دەنێ بەرەو مەزنی و خۆش گوزەرانی پشت لێکردنەوە لە دەسەلات و خەرجیان لە داهاتیان زیاتر دەبێ، ئەوسا هەژار لە ناویاندا تێدەچێت و دەوڵەمەندیش دەسکەوتی خۆی لە خۆشگوزەرانی خەرج دەکات و کاتێك میر داوا دەکات بۆ شەڕکردن خەڵك ئەو یەککرتوویی و دڵسۆزییەیان نامێنێ، بەم جۆرە لات و بێهێز دەبن، سەرئەنجام دەوڵەتیش بەرەو لاوازی و پیربوون و هەرەسهێنان دەچێت))[2] .

بیروڕاکانی خەلدونی لەگەڵ ڕەفتارەکانی (نصرالدولە)ی مەروانی یەك دەگرێتەوە، بۆیە کردارەکانی ئەم میرە لە سەردەمەکانی دوای خۆی ئاکامی خراپی لێکەوتەوە.

هەروەها دوا فەرمانڕەوای ئەم میرنشینە میر (منصور) کە خەسڵەتی ڕەزیلی بەسەریدا زاڵ بووە، ئەمەش کاریگەری خراپی لە سەر بارودۆخی سیاسی میرنشینەکە هەبوو لەسەر ئاستی دەرەوە، وەك (الفارقي) دەڵێت: ((سوڵتان (ملکشاه) داوای لەو میرە مەروانییە کرد، کە تسبیحە زێڕەکەو شمشێرەکەی پێبدات، بەلام ئەم میرە ئەوەی ڕەت کردەوە، ئەوەش وای لە سوڵتان کرد سوپای بەرو ولاتی مەروانی نارد و دەستی بەسەر سەروەت و سامانی میرنشینەکە داگرت))[3]، لەراستیدا ئەگەر ئەو هەڵوێستەی میر(منصور)راستبێت، بەلام هەڵەکەی لێرەدایە کە نەدەبوو بیانو بدات بەدەست هێزێکی زالی وەك سەلجوقییەکان بۆ هێرشکردنە سەر ولاتی مەروانی، سەربەخۆیی نشتیمانەکەی گرنگتر بوو لەبەهای ئەوشتانە، لەروانگەیەکی دیکەوە دەکرێت بلێین سولتان (ملکشاه) درکی بەوەکرد بوو،

---

١ - المقدمة، ص١٣٢. محسن محمد حسين، نظرية الدورات المتعاقبة، ، ص١٣٣.

٢- ابن خلدون، م.ن ، ص١٣٣. محسن محمد حسين، م. ن، ص١٣٤.

٣ - تاريخ الفارقي، ص٢١٨.

که ئەو تەسبێح و شمشێرە بەهایەکی گرنگ و رەمزێکی پڕبایەخیان هەیە لای ئەومیرە، بۆیە بەئەنقەست داوای کردووە.

دیارە ئەم میرەش نەیتوانیوە پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی بکات لەگەڵ سەلجوقییەکان وەك (ابن العبری) سەبارەت بە میر (منصور) دەڵێت: ((ملکەچ نەبووە، وەکو پێویست بۆ سوڵتان ملکشاه))[1] بەو مانایە کە گوێڕایەڵی نەکردووە و داخوازییەکانی نەهێناوەتەدی، بۆیە سوڵتانیش بریاری دا کۆتایی بەدەسەڵاتی بهێنێت.

ئەو سیاسەتەی میری مەروانی لەسەر ئاستی ناو خۆش کاردانەوەی هەبووە، تا ئەو ڕادەیەی مێژوونووسێك دەڵێت ڕووخانی میرنشینی مەروانی بۆ هەڵەکانی میر (منصور) دەگەڕێتەوە، چونکە لە ڕەزیلی دا بێ وێنەبوو دڵی هەموو کەسێکی لە خۆی کردبوو، بۆ دەسەڵاتداران پێویستە لە هەموو کەس زیاتر دەست کراوەبن لە سەر ژێردەستەکانی و دەست و پەیوەندو سوپاوە، تا وەکو بتوانێ بەچاکی حوکمڕانی بکات، بەڵام (منصور) لە وانە بەدوور بوو[2].

لە مێژووی میرنشینی هەزبانیدا میر (ابو الهیجاء) خزمەتی خەلافەتی عەبباسی کردو و کاروباری هەولێر و میرنشینەکەی بە هەردوو کوڕەکەی (فضل و ابو علی) سپارد، بەڵام ئەم کردارە کاردانەوەی لێکەوتەوە، لە ساڵی (٥١٧ك/ ١١٢٣ز)دا لەلایەن برازای میر (بابکر کوڕی میکائیل) لە ئامادە نەبوونی (ابو الهیجاء) سوودی وەرگرت و بە دەرفەتی زانی بۆ ماوەیەك دەستی بەسەر هەولێردا گرت[3]. شوێنەوارێکی خراپی بەجێهێشت لەسەر پێگەی سیاسی میرنشینەکە و بەرەو ناجێگیری برد.

---

١ - تاريخ الزمان، نقلة الى العربية، الأب إسحق أرملة، ، دار المشرق، بيروت، ١٩٨٦، ص١١٧.

٢ - حسین حزنی، اوریکی پاشەوە، بەشی چوارەم، ل٤-٥.

٣- ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٧٠٥. زرار صديق توفيق، القبائل و الزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، ص١٧٩.

### ٦- سیستەمی پشتاوپشت

هەندێك لە توێژەران و لێكۆڵەرەوان ئاماژە بەكاریگەری سیستەمی پشتاوپشت دەكەن لە ڕووخانی میرنشینەكان، بەڵام دەكرێت ئەو خاڵە جێگای گفتوگۆ و لێكۆڵینەوە و جێگای پرسیاربێت، تا چەند ئەم سیستەمە هۆكار بووە، بۆ ڕووخان ئایا بەدیلێك هەبووە، لە بواری فەرمانڕوایی جێگای پشتاوپشت بگرێتەوە؟ كێشەكە لە خودی سیستەمەكە بووە، یاخود لەو عەقڵیەتە بووە كە كاری پێكردوە.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی میرنشینەكان دابگێڕین دەبینین مێژوویەكی پڕ لە ناكۆكی و ناتەبایی بە دیدەكەین وەك لەپێشدا باسمانكرد، بەڵام پێمان وایە ئەم كێشە ناوخۆییانەی كە لە ئارادابوونە هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵات خوازی و ویستی تاك دەسەڵاتی.

لە میرنشینی حەسنەویهیدا شەڕی نێوان (بدر) و (هلال) ی كوڕی[1] دەكەوێتە خانەی ململانێی دەسەڵات نەك سیستەمی پشتاوپشت، بە هەمان شێوە میرنشینەكانی تریش كێشە ناوخۆییەكانیان لەم چوارچێوەیە خۆی دەنواند.

هەرچەندە توێژەرێك پێی وایە یەكێك لە هۆكارەكانی ڕووخانی میرنشینی شەدادی فاكتەری ڕژێمی پشتاوپشت بوو، لە حوكمڕانیدا[2]. و لێكۆڵەرەیكی تر جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە دەڵێت سیستەمی فەرمانڕوایی پشتاوپشت گەلێ خراپەی لە دوای خۆی جێ هێلابوو، چونكە ئەو جۆرە سیستەمە بۆ دەسەڵات پاڵی بە تاكەكانی خانەوادەی شەدادییەوە نا لەگەڵ یەكتردا بكەونە ململانێ لەسەر دەسەڵات لە هەمان كاتیشدا ئەم سیستەمە وای كرد هەندێ میری لاواز بێتە سەر تەختی دەسەڵات[3]، بەڵام

---

١- ابن الأثیر، الكامل، جـ٧، ص٥٦٣. ابن خلدون، العبر، جـ٨، ص ١٠٩٨ .

٢- اسماعیل شكر، م. س، ص٧٤ .

٣- نیشتمان بشیر محمد، كورد و سەلجوقیەكان، ل ٢٧٩.

له میرنشینی شەدادیدا ململانێی بنەماڵەیی کەمتر بە دیدەکرێت بە بەراورد لەگەڵ عەنازیی و حەسنەویهی و هەزبانییەکان له هەولێر، بۆیە ئەمە هۆکاری بنەچەیی نییه لە هەرەسهێنانی شەدادیەکان.

سەرەڕای ئەوەی ڕژێمی پشتاوپشت کەم و کوڕی خۆی هەیە، دەسەڵات لە بنەماڵەیەکی دیاریکراو قۆرغ دەکات لەو ڕێگایەدا کەسانی نا شایستە دەبن بە فەرمانڕەوا، بەشێکی زۆری سەروەت و سامانی وڵات لە لایەن بنەماڵەی حوکمڕانەوە کۆنترۆڵ کراوە بەڵام لێرەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم ناکرێت بەکارهێنانی ڕژێمی پشتاوپشت لە سیستەمی سیاسی میرنشینە کوردییەکاندا، بکەین بە ڕەخنە و ئاراستەیان بکەین،چونکە لە دنیای سیاسەت و فەرمانڕەوایی و بەڕێوە بردندا لەو کات سیستەمێکی تر نەبووە، لە ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان پەیڕەو کرابێت تا بیکەین بە بیانوو بەسەر دەسەڵاتی کوردیدا.

کەواتە خودی سیستەمەکە هۆکار نەبووە، بۆ شەڕە ناوخۆییەکان، بەڵکو ئەو عەقڵیەتەی کە کاری پێکردووە، لەو ئاستەدا نەبووە، کە بەرژەوەندی گشتی لەسەرووی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان دابنێن و ڕەچاوی خەڵك و خاك و نیشتیمانەکەیان بکەن.

دەبینین میرنشینی مەروانی بە درێژایی حوکمڕانییەکەی لەسەر بنەمای ڕژێمی پشتاوپشت ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی دەکرد و شەڕی بنەماڵەشی تێدا بەرجەستە نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت کاتێك (نظام الدين) دەبێت بە جێنشینی باوکی لە جێگای (سعید)ی برا گەورەی[1] ئەوەش تا ڕادەیەك لادانە لە سیستەمی پشتاوپشت، کە بەپێی ئەو ڕژێمە دەبووایە کوڕە گەورەکەی جێگای (نصرالدولة)ی باوکی بگرێتەوە، بەڵام بەهۆی لێهاتوویی (نظام الدين) بوو بە فەرمانڕەوی مەروانییەکان[2].

---

١ - الفارقي، م. س، ص ١٨٠-١٨١. ابن شداد، م. س، جـ٢، ق١، ص ١٦٦-١٦٧ .

٢- ابن شداد، م. ن، جـ ٢، ق١، ص١٦٧. فرست مرعي، م. س، ص ٣١٧ .

بۆیـه بـه تێڕامـان لـه دیـارده مێژووییـه‌كانی میرنـشینه كوردییـه‌كان ده‌توانین به‌وه ئاشنابین كه ڕژێمی پشتاوپشت ئه‌و فاكته‌ره به هێزه نه‌بووه، كـه ببێـت بـه بنه‌مایـه‌ك بـۆ ڕووخـانی میرنـشینه‌كان، بـه‌ڵكو كاریگه‌رییـه‌كی لاوه‌كی له‌سه‌ر شێوازی به‌ڕێوه‌بردن هه‌بووه.

## ته‌وه‌ره‌ی دووه‌م/ هۆكاره ده‌ره‌كییه‌كان

### ١- ده‌ركه‌وتنی سه‌لجوقییه‌كان و په‌یڕه‌و كردنی سیاسه‌تی مه‌ركه‌زی

ســه‌لجوقییه‌كان به‌شـێكن لــه هــۆزی غــوزی تــوركی، ناوه‌كــه‌یان ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ باپیره‌یان (سلجوق كوڕی دقـاق) كـه یـه‌كێك بـوو لـه سـه‌رۆك هۆزه‌كانی تورك، له سه‌ره‌تادا له هه‌رێمی توركستان ژیـاون، پاشـان ڕوویـان كردۆته ولاٌتانی ئیسلامی[١]، لـه نیـوه‌ی یه‌كـه‌می سـه‌ده‌ی پێنجـه‌می كۆچـی/ پـازده‌ی زاینیـدا هێرشـیان هێنایـه سـه‌ر هه‌رێمـه‌كانی ڕۆژهـه‌لاٌتی خه‌لافـه‌تی عه‌بباسی و ناوچـه كـورد نـشینه‌كان هاتنیـان بـۆ نێـو جیهـانی ئیـسلامی بـه ڕووداوێكی گرنگ هه‌ژمارده‌كرێت، له‌به‌ر ئـه‌وه‌ی شـوێنه‌وارێكی گـه‌وره‌یان لـه گۆڕه‌پان و گۆڕانی واقیعی سیاسی ناوچه‌كه دانا.

(كسروی) ئامـاژه بـه ده‌سپێكی هێرشـكاری هـۆزی غـوز ده‌كـات، لـه ساڵی (٤١٠ك/ ١٠١٩ز) بۆ سه‌ر هه‌رێمه كورد نـشینه‌كانی ئازربیجـان[٢]، بـه‌لاٌم (ابـن الأثـير) ئـه‌م هێرشـكارییه بـۆ سـاڵی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) و سـالاٌنی دواتـر ده‌گه‌ڕێنێته‌وه[٣]، كه ئـه‌و كـات مـیر (وهـسوذان كـوڕی محمـد) فـه‌رمانڕه‌وای میرنشینی ره‌وادی له‌م هه‌رێمه ده‌كرد، به‌لاٌم ئه‌و میره هیچ جـۆره بـه‌رگری و به‌رهه‌ڵستییه‌كی ئه‌و تۆی له به‌رامبـه‌ر بـه غوزه‌كـان نـه‌كرد، بـه پێـچه‌وانه‌وه

---

١ – الحسيني، زبدة التواريخ أخبار الأمراء والملوك السلجوقية، تحقيق، محمد نورالدين، الطبعة الثانية، دار اقرأ، بيروت، ١٩٨٦، ص٢٣ -٢٥. ابـن الأثـير، الكامل، جـ٨، ص٥-٦ – حسين أمين، تاريخ العراق فى العصر السلجوقي، مطبعة الأرشاد، بغداد، ١٩٦٥، ص٤٥.

٢ - شهریاران گمنام، ل١٨٦.

٣ - الكامل، جـ ٧، ص٧١٨.

پێشوازی لێکردن و ڕێزی لێگرتن و ژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەنجامدان، بۆ ئەوەی وڵات لە مەترسییەکانیان ڕزگار بکات و لە شەڕیان خۆی بە دوور بگرێت، کچی یەکێك لە میرەکانی ئەوانی مارە کرد[1]، بەڵام ئەم کردارە مەترسی و هەڕەشەکانی ئەوانی لەسەر وڵاتەکەی دوور نەخستەوە.

لەساڵی (٤٢٩ك/ ١٠٣٨ز) دا هێرشیان هێنایە سەر شاری مەراغە و مزگەوتی ئەم شارەیان سووتاند و خەڵکێکی زۆریشیان لە کوردە هەزبانییەکان کوشت بەڵایەکی گەورەیان بەسەر ئەو شارە هێنا[2].

بەم شێوەیە غوزەکان درێژەیاندا بە داگیرکاری و فراوان خوازییەکانیان، لە ساڵی (٤٣٠ك/١٠٣٩ز) دا، بە هاوکاری و یاوەری ژمارەیەك لە دەیلەمەکان دەستیان بەسەر شاری هەمەدان داگرت، و بە شێوەیەکی نامرۆڤانە ڕەفتاریان کرد، هەر وەکو(ابن الأثير) دەڵێ: ((کاتێك هاتنە ناو ئەو شارە بە شێوەیەکی وەها خراپ تاڵانیان کرد و شتی وایان دەرهەق بە هیچ وڵاتێکی دیکە نەکردووە، زۆریان کوشت و ژنەکانیان بردن، ئینجا بەرەو ئەسەدئاباد و دەینەوەر هاتن))[3].

دیارە کوردەکانی ئەو شارانە گوێبیستی خراپەکارییەکانی غوزەکان بوونە، بۆیە کاردانەوەیەکی توندیان بەرامبەریان هەبووە، بە سەرکردایەتی (ابو الفتح کوڕی ابی الشوك) بەرهەڵستیان کردن و ڕووبەڕوویان بوونەوە، ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن و زۆریشیان لێ بەدیل گرتن ئەمە ناچاری کردن بەدانوستان و وتوێژ لەگەڵ ناوبراو دا بکەن و دەست هەڵگرن لە داگیرکردنی ئەم شارانە و پاشە کشێ بکەن[4]. بەم شێوەیە هەوڵ و کۆشش و بەرهەڵستی کوردەکانی ئەم ناوچانە ئامانجەکانی خۆی پێکا و بەرهەمدار بوو، بۆ ماوەیەك مەترسییەکانی ئەم هۆزەیان دوورخستەوە.

---

١ - م.ن، جـ ٧، ص ٧١٨. حسام الدين النقشبندي، أذربيجان، ص١٥٦.

٢- ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ص٧١٨. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص١٨٠ — ١٨١.

٣ - الكامل، جـ ٧، ص٧٢٠. فرست مرعي، م. س، ص٣٧٢

٤ - ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ص٧٢٠.

غەزەكان ئاراستەی هێرشەكانیان گۆڕی لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ن) دا هاتنە نێو وڵاتی هەكاری، بۆیە كوردەكانی ئەم ناوچەیەش بەرهەڵستیان كردن، شەڕێكی توند لەنێوان هەردوو لادا ڕوویدا كە تێیدا كوردەكان شكستیان خوارد و پاشەكشەیان كرد و پەنایان بردە بەر چیا سەخت و دژوارەكان، توركەكان بوون بەخاوەنی ماڵ و سامان و ژن و منداڵەكانیان[1]، بەڵام بەوەندە هەڵوەستەیان نەكرد و نەوەستان دوایان كەوتن لە ناوچە شاخاوییەكان، بەوە كوردەكان توانیان شكستی گەورەیان پێ بهێنن، وەك (ابن الأثير) دەڵێت: ((هەزارو پێنج سەد كەسیان لێ كوژراو زۆریشیان بەدیل گیرا لەوانە حەوتیان لە سەركردەكان بوون))[2]. ئینجا ئەو غوزانە لە ساڵی (٤٣٣ك/١٠٤١ن)، ڕوو دەكەنە ناوچەی زوزان[3]، كە مەبەستیان جەزیرەی (ابن عمر– بۆتان) بوو، بەرەو دیاربەكر هاتن ئەو شارو ناوچانەی سەر ڕێگایان تاڵانكرد[4]، بەڵام مەروانییەكان توانیان بەسەریان دا زاڵبن و هەندێكیان لێ بەدیل گرتن، ئەم كردارە هۆكارێك بوو كەوا جەزیرە جێ بهێڵن و بەرەو دەوروبەری شاری موصل هاتن[5]. لە ئاكامدا (قرواش)ی عەقیلی فەرمانڕەوای ئەم شارە لەگەڵ كوردە بەشنەوییەكان وبە هاوكاری (نصرالدوله احمد) مەروانی، ڕووبەڕوویان وەستاون بەرهەڵستیەكی توندی كردن، لەئاكامدا ژمارەیەكی زۆری لێ كوشتن و شكستێكی گەورەی بەسەریاندا هێنا[6]. بەم جۆرە ئەو شار و ناوچەیە بۆ ماوەیەكی كاتی لە مەترسی و هەڕەشەكانی ئەو هۆزە كۆچكردووانە دووركەوتەوە،كە زۆربەی

١ – م. ن، جـ ٧، ص٧٢١. احمد كسروی، م. س، ص ٢٠٠. درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاری، دار سپيرێز للطباعة والنشر، دهۆك ٢٠٠٥، ص١٠٢.

٢ - الكامل، جـ ٧، ص٧٢١. احمد كسروی، م. س، ص ٢٠٠.

٣ - زوزان، شارۆچكە یەكی فراوانە دەكەوێتە ڕوژهەڵاتی دیجلە لە جەزیرەی بۆتان، ياقوت الحموي، م. س، ج٣، ص١٥٨.

٤ - ابن الأثير، الكامل، جـ ٧ ص٧٢٢. ابن خلدون، العبر، ج٧، ص٦٧٩.

٥ - ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ٧٢٢. ابن خلدون العبر، ج٧، ص٦٨٠.

٦ - ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ص٧٢٢.

هـۆزە کۆچـکردووانە دوورکەوتەوە،کـە زۆربـەی زۆری شـار و هەرێمـە کـورد نشینەکان ڕووبەڕووی هێرش و داگیرکاری هۆزەکانی غوز بوونەوە، کـە تێیـدا شەڕ و کاولکاری و تالانێکی زۆریان ئەنجامدا، دەسەڵاتی سیاسی کوردی لـەو ناوچانەدا لەرزۆك و بێهێز کرد.

دەبێـت ئـەوەش بڵـێین کـە ئەوانـە ڕێگـا خۆشـکەر بـوون بـۆ هـاتنی سەلجوقییەکان و دەست بەسەر داگرتنی ناوچە کوردنـشینەکان، کـە خۆیـان بـە شـێك بـوون لـەهۆزی غـوز وەك لـەم نامـەی (طغرلبـك) دەردەکـەوێت کـە نووسـیبووی: (ئـەم تورکانـە کۆیلـە و خـەڵك و شـوێنکەوتەی ئێمـە بـوون، فەرمانیان بەجێدەهینان و خزمەتی کۆشکەکانیان دەکردین)[1].

سـەلجوقییەکان دوای زاڵبـوون بەسـەر غەزنەوییـەکان دامەزرانـدن و چەسـپاندنی دەوڵەتەکـەیان، توانیـان دەسـەڵاتی خۆیـان بەسـەر چـەندین ناوچـەی گرنگـی جیهـانی ئیـسلامیدا بـسەپێنن[2]. دوای سـەرکەوتنەکانیان دەسـتیان کـرد بـە فراوانکردنـی ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتیان و هەرێمـە کوردنشینەکانیش لە چوارچێوەی پلانە فراوان خوازەکانیان بوو.

(طغرلبك) لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٦ن)دا فرمانی بە (ابراهیم ینال)ی برای دا بـۆ ئـەوەی بـەرەو وڵاتـی چیا بـچن و دەسـتی بەسـەر دابگرێـت، بـۆ ئـەم مەبەستە ڕووی کردە هەمەدان و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی[3]، دواتر بەرەو شاری قرمسین(کرمنشاه) هـات و لـە ژێـر ڕکێفـی (ابـو الـشوك) فـەرمانڕەوای عەنازی دەرهێنا[4].

---

١ - م. ن، جـ ٧، ص ٧٢٢.

٢ - البیهقي، تاریخ البیهقي، ترجمة، یحیی الخشاب و صادق نشأت، دارالنهضة العربیة، بیروت ١٩٨٢، ص٦٩٥. حسین امین، م. س، ص٥٣ - ٥٤. علی محمد صلابي، الدولة السلاجقة، مؤسسة اقرأ للنشر والتوزیع، القاهرة ٢٠٠٦، ص٢٩ - ٣٠.

٣ - ابن الأثیر، الکامل، جـ ٧، ص٥٢. ابو الفدا، المختصر، جـ ٢، ص١٦٨.

٤- الاصفهاني، تاریخ دولة آل سلجوق، اختصار، الفتح بن علی بن محمد البنداري الاصفهاني، الطبعة الثانیة، دار الافاق الجدیدة، بیروت ١٩٧٨، ص١٠ - ابن الأثیر، الکامل، جـ ٨، ص٥٢. سبط الجوزی، م. س، ص ٢٩١. ابو الفدا، المختصر، جـ ٢، ص١٦٨.

ئەمە بواری لە بەردەم (ینال) فراوان کرد و سەرکەوت لە داگیرکردنی زۆربەی شارەکانی ئەم هەرێمە دوای ئەوەی بەرەو حولوان چوون و ماڵی (ابو الشوك) یان سوتاند و دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت[1].

بەم شێوەیە هێرشی سەلجوقییەکان شارەکانی هەرێمی چیایی وێران کرد و دانیشتووانەکانیان کوشتن و ماڵەکانیان بە تالآن بردن، بەلآم لەم قۆناغەدا سەلجوقییەکان تەنها مەبەستیان داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتن و ملکەچکردنی میرەکان و هێشتنەوەی میرنشینەکان بە لاوازی و بێهێزی بە شێوەیەك توانای بەرهەڵستیان نەبێت.

سوڵتان (طغرلبك) دوای سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی، بەسەر شار و قەلآ کوردییەکانی هەرێمی چیا لە ساڵی (٤٤١ك/١٠٤٩ن)دا نێردراوێکی بۆ (نصرالدولة احمد)ی مەروانی نارد داوای لێکرد لە وڵاتەکەیدا وتاری هەینی بەناوی ئەو بخوێنێتەوە، میری مەروانی گوێڕایەڵی دەبێت و ڕازی بوو، لەسەر ئەوەی کە وتار لەسەرجەم دیاربەکر بە ناوی سوڵتانی سەلجوقی بخوێندرێتەوە[2].

دیارە میر(نصرالدولة) لەم کردار و هەنگاوەی کە ئەنجامیدا ئامانجی ئەوە بوو، کە وڵاتەکەی لە مەترسی و وێرانکاری سەلجوقییەکان بەدوربگرێت، ئەو دیاردەی هەرێمی چیا لەوێ دووبارە نەبێتەووە پارێزگاری لە خەڵك و خاکی مەروانی بکات سەروماڵیان بپارێزێ، جگە لەوەش ئەم میرە لە خۆشگوزەرانی و ڕەفاهیەتێکی زۆر دەژیا، ڕەنگە ئەمەش بوبێتە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی بارودۆخی خۆشگوزەرانییەکەی لێ تێکنەچێت.

بە دڵنیاییەوە ئەو دانپێدانان و گوێڕایەڵی کردنە لە ناخ و دڵەوە نەبوو، وەك لە وەلآمی ئەو نامەیەی (نصرالدولة)ی مەروانیدا دەردەکەوێت کە بۆ

---

١- ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ص٥٣. سبط ابن الجوزي، م. س، ص٣٩٢. ابن كثير، م. س، جـ١٢، ص٥٤. ابن تغري بردي، م. س، جـ٥، ص٤١.

٢ - ابن الأثير، م. ن، جـ ٧، ص٧٨.

بانگ خوازی فاتمی (المؤید فی الدین) نووسیبووی و دەڵێت: ((وەڵامی بانگەوازی تورکە تاغیەکانم داوەتەوە، ئەمەش بۆ پاراستنی خۆم و گونجان لەگەڵ وەختەکەی))[1].

لەگەڵ ئەوەی یەکێك لە توێژەران دەڵێت: ((دەسەڵاتی سەلجوقییەکان دوور بوو لە وڵاتی مەروانی، چیای زاگرۆسیان نە بڕیبوو، نەگەیشتبوونە عێراق و ئازربیجان بۆیە هۆکارێکی پەسند نەبوو، کە پاساوبێ بۆ ئەم هەڵوێستە، لەو کاتەدا هیچ مەترسییەکی دەرەکی لەسەر دەوڵەتی دۆستەکی نەبوو، لەلایەن بیزنتینییەکان، یاخود هەریەك لە دراوسێکانی، تاوەکو وا لە (نصرالدولة) بکات بشڵەژێ و پەیوەندی فەرمی بە سەلجوقییەکان بکا و ملکەچی بنوێنێ[2].

سەرئەنجام بەهەر هۆکارێك و شێوازێك بێت سەلجوقییەکان توانیان عەقلیەتی سیاسی خۆیان فەرز بکەن بەسەر دەسەڵاتی سیاسی کوردی، کە ئەوەش هەنگاوی یەکەم بوو بۆ هەڵوەشاندنەوە و لەباربردنی میرنشینە کوردییەکان کە بەشێوەیەکی تیۆری هەنگاوی بۆ نرا.

دوابەدوای ملکەچی و گوێڕایەڵی کردنی مەروانییەکان، سوڵتان (طغرلبك) درێژەی بە فراوان خوازی و هێرشکارییەکانی دا لە هەرێمە کوردنشینەکاندا، لەم چوارچێوەیەدا ڕووی کردە ناوچەی ئازربیجان لە ساڵی (٤٤٦ك/١٠٥٤ز)دا، دەستی بەسەر تەبرێزی پایتەختی میرنشینی رەوادییەکان دا گرت[3]. لەو ئان و ساتەدا میر (ابو منصور وهسوذان کوڕی محمد)ی

---

١ - سیرة المؤید فی الدین داعی الدعاة، تحقیق، محمد کامل حسین، دار الکتاب المصری، القاهرة ١٩٤٩، ص١٠٨.

٢ - عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة فی کوردستان الوسطی، الطبعةالثانیة، القسم الحضاري، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربیل ٢٠٠١، جـ٢، ص٤٩ -٥٠.

٣ - العظیمي، تاریخ العظیمي، تحقیق، علی سویم، انقره ١٩٨٨، ص١٠. ابن الأثیر، الکامل، جـ ٧، ص١١٦. ابو الفدا، المختصر، جـ٢، ص١٧٢ ابن الوردي، م. س، جـ١، ص٣٤٣. النویري، نهایة الارب فی فنون الادب، تحقیق، نجیب مصطفی فواز و حکمت کشلی فواز، دار الکتب العلمیة، بیروت ٢٠٠٤، جـ ٢٦، ص١٦٦.

ڕەوادی فەرمانڕەوای ئەو میرنشینەی دەکرد، ئەویش گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ ڕاگەیاند و وتاری بەناوی سوڵتان خوێندەوە، دیاری و سەروەت و سامانی نارد بۆ ڕازیکردنی تەنانەت یەك لە کوڕەکانی وەکو بارمتە بۆ نارد[1]، بەمەش میرنشینی ڕەوادی کەوتە ژێر ڕکێفی سەلجوقییەکان و بە جۆرێك لە جۆرەکان سەربەخۆیی خۆی لە دەست دا.

بە هەمان شێوە لە ساڵی (٤٤٦ك/١٠٥٤ ز)دا سوڵتان (طغرلبك) بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی شەدادی چوو لە ئاران، میر (ابو الاسوار)ی خاوەنی شاری گەنجە ناچار کرد کە گوێڕایەڵی بوونی خۆی ڕابگەیەنێ بۆ سەلجوقییەکان و وتار بە ناوی سوڵتان بخوێنێتەوە[2]. ئەمە لە کاتێکدا دێت کە سەلجوقییەکان چەندین هەرێمیان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و زۆربەی زۆری میرە کوردییەکان ملکەچی خۆیان پیشاندا بوو، بۆیە شەدادییەکانیش لەو نێوەندەدا ئەو توانایەیان نەبوو، بەرهەڵستی و بەرگری بکەن.

بەم شێوەیە دەبینین میرانی کورد لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە سیاسییە سەربەخۆییەی کە لە نیشتیمانەکەیاندا پێکیان هێنابوو، گوێڕایەڵ بوونی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند،

بەڵام میرنشینەکان بۆ زەمەنێکی تر بە شێوەیەك لە شێوەکان لە فەرمانڕەوایی کردنی هەرێمەکانیان بەردەوام بوون ئەو سوڵتانە لە مامەڵەی سیاسیدا لە سەر شێوازی پەیڕوکردنی سیستەمی لامەرکەزی دەڕۆی.

سەلجوقییەکان دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لە نێوانیشیان ناوچە کوردنشینەکاندا بەدەستیان هێنا، بەتایبەتی لەو کاتەی کە زۆربەی دەوڵەت و میرنشینەکانی ئەو ناوچەیە پشتگیری خۆیان بۆ دەربڕیبوون، ئەمە ڕێگای هاتنە ناو بەغدای

---

١ - ابن الأثير، الكامل، جـ ٧، ص١١٦. ابو الفدا، المختصر، جـ٢، ص١٧٢- النويري، م. ن، جـ٢٦، ص١٦٦. ابن الوردي، م. ن، جـ١، ص٣٤٣. حسام الدين النقشبندي، اذربيجان، ص١٧٠.

٢- ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص١١٦ .

بۆ سەلجوقییەکان ئاسان کرد و لە ساڵی(٤٤٧ك/١٠٥٥ز) هاتنە ناو ئەم شارە[1].

فەرمانڕەوای سەلجوقییەکان دوای مردنی (طغرلبك) لە ساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز)دا[2] دەکەوێتە دەست (أُلب ارسلان)ی برازای[3]. ئەویش لەسەرەتادا لەسەر هەمان سیاسەت ڕۆیشت لە پەیڕەو کردنی سیستەمی لامەرکەزی بەرامبەر بە ناوچە کوردنشینەکان، بەڵام دەکرێت بڵێین ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کە لە شەڕی مەلازگرد لە ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) بەسەر بێزنتینییەکان بە دەستیان هێنا[4]، گۆڕانێك لە هەڵوێستی سەلجوقییەکان و واقیعی سیاسی ناوچەکە بە دیدەکرێت، ئەوە بوو یەکەم کاری سوڵتان (أُلب ارسلان) دوای تەواوبوونی شەڕەکە هەڵسا بە زیندانی کردنی (مملان کوری وهسوذان) ی ڕەوادی و منداڵەکانی[5]، هەروەها سوڵتان والی خۆی لەسەر شاری خەلات و مەلازگرد دانا، وەك (الفارقی) دەڵێ: ((ئەم دوو شارە لە ژێر فەرمانڕەوایی مەروانییەکان دەرچوون))[6]. ئەوە ڕێگا خۆشکەرێك بوو بۆ سوڵتان (ملکشاه) کە لەساڵی (٤٦٥ك/١٠٧٢ز)دا

---

١ - العظيمي، م. س، ص١٠. الاصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص١٢ النويرى، م. س، جـ٢٦، ص١٦. ابن تغري بردي، م. س، جـ٥، ص٥٧.

٢ - ابن النظام الحسيني، العراضة فى الحكاية السلجوقية، ترجمة وتحقيق، عبدالنعيم محمد حسين و حسين امين، مطبعة جامعة بغداد، بغداد ١٩٧٩، ص٤٤. حسين امين، م. س، ص٧١.

٣ - الأصفهاني، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٣٠. على محمد الصلابي، دولة السلاجقة، ص٧١.

٤ - الراوندي، راحة الصدور واية السرور فى تاريخ الدولة السلجوقية، نقله الى العربية، ابراهم امين الشواربى، عبد النعيم محمد، فواد عبدالمعطى، الطبعةالثانية، مطابع دارالقلم، القاهرة، ٢٠٠٥، ص١٨٩. الحسينى، زبدة التواريخ، ص١١٠-١١٢ — ابن النظام الحسيني، م. س، ص٤٧.

٥ - مينورسكى، تاريخ قفقاز، ص٢٤٢ - ٢٤٣. حسام الدين النقشبندي، اذربيجان، ص١٧٥.

٦ - تاريخ الفارقي، ص١٩٠.

دەسەڵاتی وەرگرت[1] و سیاسەتی سەلجوقییەکان بەرامبەر بە میرنشینەکان بە تەواوی گۆڕانی بەسەر داهات، ئەو سوڵتانە بڕیاریدا کۆتایی بە دەسەڵاتی قەوارە کوردییەکان بهێنێ و سیستەمی مەرکەزی پەیڕەو بکات و هەموو فەرمانڕەوا کوردەکان بە بڕیاری ناوەندی سەلجوقی ببەستێتەوە، وەك لە کردارەکانی دەردەکەوێت.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین سەرکەوتنی سەلجوقییەکان لەسەر بێزەنتینییەکان ویستی تاك دەسەڵاتی و سەپاندنی مەرکەزیەت لایان گەشەی کرد و دەسپێکی ئەم ناوەند خوازیەش دوای شەڕی مەلازگرد دێت، بە دەست بەسەرداگرتنی ئازربیجان و ڕووخانی میرنشینی ڕەوادی لە ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز)، دەستی پێکرد[2]. لەگەڵ ئەوەی یەکێك لە توێژەران پێی وایە کە ئەم میرنشینە لە ساڵی (٤٦٩ك/١٠٧٩ز)دا ڕووخاوە، بەڵام ئاماژەی بەهیچ سەرچاوەیەك نەکردووە، جگە لەوەی ئەمەی ڕوون نەکردۆتەوە لەم ماوەیەکێ فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەی کردووە[3].

سوڵتان (ملکشاه) دوابەدوای ئەوەی دەسەڵاتی وەرگرت، دەستیکرد بە لەناوبردنی میرنشینەکان و پەرەپێدان بە بیرۆکەی ناوەند خوازی، میرنشینی شەدادی لە سەردەمی ئەم سوڵتانە دوایی هات وەك لە کتابی (جامع الدول) باسکراوە، کە سوڵتان (أُلب ارسلان) وڵاتی باب الأبواب و (ئاران) ی بە گەورە سەرکردەو خولامکاری خۆی (ساوتکین) بەخشی لەگەڵ کۆمەڵێك لە تورکەکان لە ساڵی (٤٦٨ك/١٠٧٦ز)دا بەرەو ئەم وڵاتە هات، بەڵام (فضلون) ڕەتی کردەوە وڵاتەکەی بە دەستەوە بدات، دواجار کەزانی ناتوانی پارێزگاری و بەرگری لێبکات، بۆیە شاری گەنجەو وڵاتی ئارانی بە

---

١ - ابن القلانسي، ذيل تاريخ دمشق، مطبعة الاباء اليسوعيين، بيروت ١٩٠٨، ص١٠٦. الراوندي، م. س، ص١٩٤. الأصفهاني، تاريخ دولة آل سلجوق، ص٤٨. الحسيني، زبدة التواريخ، ص١١٩. النويري، م. س، جـ ٢٦، ص١٨٤ -

٢ - الأصفهاني، تاريخ دولة آل سلجوق، ص٤٤. مينورسكى، تاريخ قفقاز، ص٢٤٣.

٣ - نيشتمان بەشير محمد، كوردو سەلجوقييەكان، ل٢٨٠.

نوێنەری سوڵتان دا، تورکەکان تێیدا نیشتەجێ و سەقامگیر و باڵا دەست بوون بەسەر سەرجەم دەشت و شاخ و قەڵاکان و میرنشینی شەدادی لەبەر یەك هەڵوەشایەوە و کۆتایی هات[1]، ئەوەی لەم دەقە بەدیدەکرێت ئەوەیە کە (أُلب ارسلان) لەو ساڵەدا نەماوە، بەڵکو سەردەمی فەرمانڕەوایی (ملکشاه) بووە، بەڵام دەکرێت ئەم مێژوونووسە بەهەڵە ناوی (أُلب ارسلان)ی هێنابێت.

لەگەڵ ئەوشدا بۆچوونێکی تر هەیە، کەوا میر (فضلون) فەرمانڕەوای بەسەر گنجەو شارەکانی دیکە کردووە، تاساڵی (٤٨١ك/١٠٨٨ن) بەردەوام بووە[2]، لەو ساڵەدا سوڵتان (ملکشاه) میر (بوزان)ی بۆ سەرکوتکردنەوەی ناوبراو ناردووە پاش ئەوەی یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاندبوو، سەرئەنجام توانی میر(فضلون) دەستگیر بکات و بەرەو بەغدای ڕاپێچ بکات و لە ساڵی (٤٨٤ك/١٠٩١ن)دا لەو شارەدا لە مزگەوتێکی سەر ڕووباری دیجلە کۆچی دوایی کرد[3]. لەگەڵ جیاوازی بیروڕا لەسەر ساڵی ڕووخانی شەدادییەکان، بەڵام سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا ئەم میرنشیە لە وڵاتی ئاران کۆتایی هات لەسەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان (ملکشاه) ی سەلجوقی سەرەڕای ئەوەی ئاماژەی تر هەیە، کەوا دەسەڵاتی شەدادی بە شێوەی پشتاوپشت لە شاری ئانی لە ئەرمینیا بەردەوام بووە[4].

بێگومان دەبێ ئەوەش بڵێین هەبوونی ئەم دەسەڵاتە لەو شارە بە ویستی سەلجوقییەکان بووە، نەك بەشێوەیەکی میرنشینی سەربەخۆ ڕەفتاریان کردبێ لەبەر ئەوەی سەلجوقییەکان هێزێکی گەورە و باڵا دەستی

---

١ - منجم باش، جامع الدول، ص١٨. اسماعيل شكر، م. س، ص٧٣

٢ - احمد كسروى، م. س، ص٣٠٠. نیشتمان، کورد و سەلجوقییەکان، ل٢٧٨. اسماعيل شكر، م. س، ص٧٣.

٣ - مينورسكى، تاريخ قفقاز، ص٨٦ -٨٧. احمد كسروى، م. س، ص٢٠١.

٤ - مينورسكى، م. ن، ص١١٥، ص١٤٢. احمد كسروى، م. ن، ص٢٠٧، ص٢٢٠. اسماعيل شكر، م. س، ص٧٣.

ئەوکات بوون، میرنشینەکانی تریشیان ڕووخاند، بۆیە ئەوە ناچێتە عەقڵەوە کە لەکاتێکدا دەزانین کە ئەم شارە خۆیان لە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکان ڕزگاریان کردووە[1].

سەلجوقییەکان سیاسەتی بە مەرکەزی کردنی هەرێمەکانیان کردبووە ستراتیژەك و لەسەری دەڕۆیشتن، لە بەرنامەی کاری خۆیان کاریان بۆ دەکرد، بۆیە دەربڕینی گوێڕایەڵی و ناردنی سەروەت و سامانی بەردەوام نەبۆتە پارێزگاری کردنیان و مانەوەی میرنشینەکان و لەسەر شانۆی سیاسی، ئەوەتا مەروانییەکان لەگەڵ ئەوەی ملکەچییان بۆ سەلجوقییەکان تازەکردۆتەوە و دیاری و پارەیان بۆ ناردوون، وەك (أسامة بن منقذ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: ((سوڵتان (ملکشاه) داوا لە (ابو الهیجاء)ی خاوەنی هەولێر دەکات بچێت ئەو سێ هەزار دینارەی لای میری مەروانی خاوەنی دیاربەکر بۆ وەربگرێت))[2].

بێگومان بەخشینی ئەو برە پارەیە لە پێناو دوور خستنەوەی شەڕی سەلجوقییەکان بوو، هەر وەکو میری مەروانی خۆی دەڵێ: ((فراوانی وڵاتەکەم و زۆری خێروبێر و بێستانەکانی و زۆری جوتیار و ئاوەدانی ناوچەکانی هەموو ئەوانە ناکەم بە قوربانی سێ هەزار دینار))[3]. بەڵام دواجار سەلجوقییەکان هەر تەنها بە وەرگرتنی ماڵ و سامان ڕازی نەبوون، بەڵکو بڕیاریاندا بە شێوەیەکی کرداری دەستبەسەر میرنشینەکە دابگرن و لەناوی ببەن، ئەوەتا لە ساڵی (٤٧٧ك/١٠٨٤ز)دا سوپایەکیان ئامادە کرد بە سەرکردایەتی(فخر الدولە) بە ڕەو دیاربەکر هات[4].

---

١ - النويري، م. س، جـ٢٦، ص١٧٧- ١٨٧. مينورسكى، تاريخ قفقاز، ص١١٦.

٢ - كتاب الأعتبار، تحقيق، عبدالكريم الأشتر، الطبعة الثانية، المكتب الاسلامي، بيروت ٢٠٠٣، ص١٦٥.

٣ - م. ن، ص١٦٦.

٤ - الفارقى، م. س، ص٢٠٨. ابن شداد، م. س، جـ٣، ص٣٨٤.

له کاتێکدا که میر (ناصرالدولة منصور) ی مەروانی ئەو هەواڵەی بیست کە سوپای سەلجوقی لە وڵاتەکەی نزیك بووەتەوە، هەوڵیدا بە جۆرێك مەترسیەکە نەهێڵێت و بەربەست لەبەردەم پێشڕەوی سوپاکە دابنێ، بۆیە کاروباری میرنشینەکەی بە (ابو سالم طبیب) سپارد، خۆی بە هاوشانی کۆمەڵێك لە خەڵکی میافارقین و چەند میرێکی کورد بۆ دیداری سوڵتان (ملکشاه) بەرەو ئەسفەهان هاتن بۆ ئەوەی داوا لە ناوبراو بکەن کە پێشگیری لە سوپاکەی بکات و هێرشەکە بوەستێنێ[1]. تەنانەت (ناصرالدولة) پێی ڕاگەیاند کە بەشێك لە وڵاتەکەی دەدات بە ئەو تەنها لە داگیرکاریەکە دەست هەڵگرێ[2]، بەڵام هەموو ئەو داخوازی و داواکاری و نزمی نواندنە بێ ئاکام بوو، سوڵتان سوور بوو لەسەر پێشڕەوی کردن و داگیرکردنی وڵاتی مەروانی.

(فخر الدولة) سوپاکەی کرد بە دووبەش خۆی بەرەو میافارقین ڕۆیشت و بەشێکی تری سوپاکەی بە سەرکردایەتی (زعیم الدولة ابو القاسم)ی کوڕی لەگەڵ سەربازێکی زۆر بەرەو ئامەد نارد[3]. سەرئەنجام لە ساڵی (٤٧٨ك/١٠٨٦ز)دا دەستیان بەسەر وڵاتی مەروانی داگرت و کۆتاییان بە میرنشینەکە هێنا[4].

سەلجوقییەکان بوون بەو هێزە مەترسیدارە لە بەردەم میرنشینە کوردییەکان یەك بە دوای یەك بەرەو هەڵوەشانەوە و لەناو چوونی بردن، میرنشینی عەنازی یەکێك بوو لەوانەی کە سەلجوقییەکان هەر لە ڕۆژگاری داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی خاکی ئەم میرنشینە بە شێوازێکی نامرۆڤانە ڕەفتاریان لەگەڵ خاك و خەڵکی ئەم وڵاتەدا کردووە، دەستیان لە کاروباری ناوخۆی ئەم میرنشینە وەردەدا تا ئەو ڕادەیەی کە

---

١ – الفارقي، م.ن ، ص٢٠٨ - ٢٠٩. ابن شداد، م. ن، جـ٣، ص٣٨٣-٣٨٤.

٢ – الفارقي، م. ن، ص٢١٠ . ابن شداد، م. ن، جـ٣، ص٣٨٤.

٣ – الفارقي، م. ن، ص٢٠٩. ابن شداد، م. ن، جـ٣، ص٣٨٤.

٤ – الفارقي، م. ن، ص٢١٢. ابن شداد، م. ن، جـ٣، ص٣٨٥.

سـەربەخۆیان لـە دەسـتدا بـوو، میرەکـان گوێڕایـەڵ و شـوێنکەوتووی سەلجوقییەکان بوون، هەر وەك (ابـن الأثـیر) بۆمـان دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ سوڵتان (محمد بن ملکشاه) لە ساڵی (٥٠٢ك/١١٠٨ز) داوای لـە هەنـدێك لـە میرە کوردەکان کرد یەکێك لەوانە (نصر کوڕی مهلهل کوڕی ابـو الـشوك)ی عەنازی بوو، بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن دژی (جـاولی سقای) کـە لـە سـاڵی (٥٠٠ك/١١٠٦ز) دەستی بەسەر موصل داگرتبوو[1].

ئەمـە ئـەو ڕاسـتیەمان بـۆ دەسـەلمێنێ کـە میرەکـانی عـەنازی هەڵسوکەوتی سیاسییان لە ژێر کاریگەری عەقڵیەتی سەلجوقییەکاندا ئاراستە دەکـرا، هەرچـەندە ئـەم میرنـشینە کـەوتبووە ژێـر دەسـەڵاتی ناوەنـدی سـەلجوقییەکان کـە دووچـاری لاوازی و جـۆرە هەڵوەشـاندنەوەیەك هـاتبوو، بـەڵام تـا سـاڵی (٥١١ك/١١١٧ز) بـەردەوام بـوو[2]. هۆکـاری سـەرەکی و ڕاستەوخۆی ڕووخانی ئەم میرنشینە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری و کارتێکردنی ئەو سیاسەتەی کەوا سەلجوقییەکان پەیڕەویان دەکرد.

ئەوەی جێگای سەرنجە تەنها میرنشینی هەزبانی لـە هـەولێر مایـەوە و درێـژەی دەسـەڵاتەکەی خۆیـدا، لـە سـەردەمی (ملکـشاه) و دوای ئـەویش سەلجوقییەکان هەوڵیان نەداوە ئەم میرنـشینە بڕووخێنن، ئـەوەش دەکرێـت لەبـەر ئـەوە بێـت کـە ئـەم میرنـشینە لـە سـنوورێکی جـوگرافی بەرتەسـکدا دەسەڵاتدار بوون، جگە لەوەش هیچ مەترسـییەکیان لەسـەر سـەلجوقییەکان دروست نـەکردووە، بـە هـۆی سـەرقاڵ بـوون بـە ململانێـی ناوخۆییـەکانیان هـەروەك باسمـان کـرد، سـەرەڕای ئـەوەی مـیرە هەزبانیـەکان گوێڕایـەڵی سەلجوقییەکانیان کردوە هاوکار و یارمەتی دەری ئەوان بوونـە، ئـەوەتا (ابـو الهیجـاء)ی مـیری هـەزبانی بەڕاسـپاردەی سـوڵتان (ملکـشاه)ی سـەلجوقی

---

١ - الکامل، جـ٨، ص٥٦٣- ٥٦٤.

٢- ابو الفدا، المختصر، جـ٢، ص٢٢٢. بدلیسي، س. پ، ل٤١. فرست مرعي، م. س، ص٤٢٢. بابا مردوخ روحا نی، م. س، ص١٠٣.

دەچێت بۆ وەرگرتنی پارە لە میرنشینی مەروانی[1]، هەروەها لە ساڵی (٥٠٥ك/١١١١ز) بە هۆی بانگەشەی سوڵتانی سەلجوقی (ابو الهيجاء) فەرمانڕەوای هەولێر دەچێت بۆ کوشتاری (خاچدروشمەکان — فەرەنجیەکان)[2]. هەر لەسەر ئەو بنەمایە هەزبانییەکان لە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان مانەوە، بەڵام دەسەڵاتیان درێژەی نەکێشا، چونکە دەرکەوتنی (عمادالدين زنكى) لە شاری موصل کاریگەریەکی گەورەی هەبوو، لەسەر ڕووخانی ئەم میرنشینە کاتێك (زنكى) دەستی کرد بە فراوانخوازی بە ناوچەکانی دەوروبەری، لە ساڵی (ك٥٢٢/١١٢٨ز)دا، هەولێری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و کۆتایی بەم میرنشینە هێنا[3]. وێرای ئەوەی (ابن واصل) پێی وایە ناوبراو لە ساڵی(٥٢٦ك/١١٣٢ز)دا دەستی بەسەر هەولێردا گرتووە[4] بەم شێوەیە فاکتەری دەرەکی ڕۆڵی کاریگەر و کارای هەبووە لە هەرەسپێهێنانی میرنشینە کوردییەکاندا.

## ٢- شەڕ و ململانێی میرنشینەکان لەگەڵ هێزە هاوسنوورەکانیان

هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی ئەو ناتەبایی و ناکۆکییەی کە لەنێوان میرنشینەکوردییەکان و هێزە هاوسنووریەکانیاندا هەبووە، کە زۆر جار ئەم پەیوەندیەی نێوانیان خۆی لە شەڕدا دەبینیەوە، ناسەقامگیری و نائارامی زۆری بەخۆیەوە بینی بوو، لە کاتێکدا جەنگ بۆخۆی نەهامەتی و بە فیڕۆدانی سەروەت و سامانی بەدواوەیە کە ئاکامەکەی بێهێزی و لاوازی لێدەکەوێتەوە.

---

١- أسامة بن منقذ، م. س، ص١٦٥

٢ - ابن الأثير، الكامل، جـ٨، ص٥٧٨. سوتر، مادة أبو الهيجاء، دائـرة المعاف الاسلامية، ج٢، ص٢٩

٣- ابو شامة، م. س، جا، ص١٥٧. عباس العزاوي، م. س ، ص٣٢

٤- مفرج الكروب فى اخبار بنى ايوب، تحقيق، جمال الدين الشيال، مطبعة جامعة فؤاد الاول، القاهـرة ١٩٥٣، ج١، ص٩٧

میرنشینی شەدادی بە هۆی نزیکی سنووری جوگرافی لەگەڵ ئەرمەن و کرج و روسەکان، دەتوانین بڵێین شەڕ باڵی بە سەر پەیوەندییەکانیان دا کێشابوو، بە تایبەتی لەگەڵ ئەرمەنەکان کە بارودۆخی ئەم میرنشینەی شلەژاو نا جێگیر کردبوو، هەروەك لە سەردەمی (فضلون کوڕی محمد)ی شەدادی لە ئەنجامی سەپاندنی دەسەڵاتی و فراوانخوازی و بە ناوچەکانی ئەرمینیاو کرجستان دا[1]. ڕووبەڕووی شەڕو کوشتارێکی زۆر بووە و بە هۆی ئەو هێرشانەی کە بۆ سەر ئەرمینیا ئەنجامیدا لەسەر دەمی مەلیك(داویت بی خاك) کە فەرمانڕەوا بوو لەسەر بەشێکی ئەرمینیا، دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر میر(فضلون) شکستی خوارد، بەڵام لە ساڵی (٣٩٤ك/١٠٠٣ز)دا (فضلون) بۆ جارێکی تر هێرشی بردە سەر وڵاتی ئەرمەن ناچاری کردن باجی ساڵانە بدەن[2].

تەنگژە و شەڕ باڵی بەسەر پەیوەندیەکاندا کێشا بوو، دەبینین لە ساڵی (٤٢١ك/١٠٣٠ز)دا کاتێك (فضلون) بەمەبەستی غەزاکردن هێرش دەکاتە سەر خەزەرەکان ژمارەیەکی زۆر لێ دەکوژی و هەندێکیان دەستگیر دەکات و دەستکەوتێکی زۆر کۆدەکاتەوە، بەڵام لە گەڕانەوەدا کەوتنە دوای (فضلون) و لەناکاو بەسەریان دادا و نزیکەی دە هەزار کەسیان لێکوشتن شکستیان پێهێنا، هەموو ئەو دەستکەوت و سامانەیان بردەوە کە دەستیان بەسەردا گرتبوو[3]. دەکرێ بڵێین ژمارەی ئەو کوژراوانە تارادەیەك دوورە لەراستیەوە، بەلام ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەدادیەکان زەرەرو زیانێکی زۆریان لێکەوتووە.

بێگومان ئەو شەڕ و کوشتار و هێرش بردن و شکست خواردن و نائارامی و نا جێگیرییە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر لاوازی میرنشینەکە

---

١- احمد کسروی، م. س، ص٢٦٩ .

٢- اسماعیل شکر، م. س ، ص٨٥.

٣- ابن الأثیر، الکامل، جـ٧، ص٧٤٠. سبط ابن الجوزي، م. س، ص٢٤٦.

هـەبوو، کـە دەرئەنجامەکـەی توانـای بـەرگری کردنیـان نـەماوە، ئەگـەر بـۆ ماوەیەکی کورتخایەنیش ئاسـایش بەرقـەرار بووبـێ وەك لەسـەر دەمـی (أبـو الاسوار شاور کوری فضلون) دەبینین بـە کـارتێکردنی ژن و ژنخـوازی لەگـەڵ پاشای ئەرمەن پەیوەندی نێوانیان بەرەو ئاشتبوونەوە چووە[1]، بـەڵام ئـەو پەیوەندییـە بـەردەوام نـەبوو، (ابـو الاسـوار) هێـرش دەکاتـە سـەر بەشـێکی ئەرمینیا شەڕ و کوشـتارێکی زۆر لـە نێوانیانـدا ڕوودەدات بازنـەی شـەڕەکان فـراوانتر دەبـن (داود) پاشـای ئەرمـەن داوای هاوکـاری لـە پاشـای ئـانی و فەرمانڕەوای کرجستان دەکـات، کـە هـاو ئـاینی یـەکتربوون بـە هاوپـەیمانی ئەوان ڕووبەڕووی شەدادییەکان دەبێتەوە[2].

لەڕاستیدا شێوازی پێکهاتەی دەسەڵاتەکان لەسەر بنەمای هێـز بنیـات نراو، بۆیە بەهێزی هۆکارێك بووە بۆ هێرش بردن و بێهێـزیش تاکـە پەناگـەی بریتی بووە لە بەرگریکردن، یاخود پەنابردن بۆ هێزێکی تر کـە هـاوبیر و هـاو ئاینی بێـت، سـەرەڕای ئـەو هێـزە نەیارانـەی کـە شـەدادییەکان هـەیان بـوو، هەندێك جا ڕووبەڕووی شـەڕ و کوشـتار دەبوونـەوە لەگـەڵ ڕۆمـەکان[3]. لـەم لاشەوە روسەکان دەرفەتێك و هەلێکیان بۆ بهاتایە پێش درێخیان نـەدەکرد و هێرشیان دەهێنایە سەر وڵاتی ئاران وەك ئەوەی لـە سـاڵی (٤٢٣ك/١٠٣١ن)دا ڕوویدا[4].

بـە هـەمان شـێوە میرنـشینی ڕەوادیـش بـەو پێیـەی کـە پێگەیـەکی سنووری هەبوو، بۆیە شەڕ و ململانێیـان لـە نێوانـدا بەدیـدەکرا لەگـەڵ هێـزە هاوسنووره نائیسلامییەکان، دەکرێت فاکتەری سەرەکی لە بەرپابوونی شـەڕ و ناکۆکی بۆ دوو لایەنی سەرەکی بگەڕێنینەوە، یەکێك لەوانە پاڵنەری ئـاینی ڕۆڵی خۆی بینیوە، کە ڕەوادی و شـەدادیەکان هـەڵگری بـیرو بـاوەڕی ئـاینی

١- احمد کسروی، م. س، ص ٢٨٦. حسین حزنی، کوردستانی موکریان، ل ٤٠٨.
٢- احمد کسروی، م. ن، ص ٢٨٩-٢٩٠. حسین حزنی، هـ. س، ل ٤١٣ — ٤١٤.
٣- احمد کسروی، س. پ، ص٢٩٢- ٢٩٣ . حسین حزنی، هـ. س، ل ٤١٩- ٤٢٢.
٤- منجم باش، م. س ، ص١٢. اسماعیل شکر، م. س، ص٩١.

ئیسلام بوون، بەپێچەوانەوە ئەرمەن و ڕۆمەکان خاوەنی ئاینی مەسیحی بوون و لەلایەکی ترەوە ناکرێت ئارەزووی فراوانخوازی فەرامۆش بکەین، کە ڕۆڵی هەبووە لە شەڕو داگیرکاریدا.

میرنشینی ڕەوادی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (مملان) زۆرترین شەڕی تێدا ئەنجامدرا، کە سەرەتای هێرشەکانی ئەم میرە بۆ سەر ئەرمەنستان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ز) کە تێیدا ئەرمەنیەکان داوای یارمەتیان لە کرجستان و (غاغیق) پاشای ئانی کرد بۆ کۆمەك کردن، یارمەتی دانی سەرئەنجام سوپایەکی زۆریان کۆکردەوە، وەك (ماتیوس) مێژوونووسی ئەرمەن دەڵێ: ((کاتێك ڕەوادییەکان هەڵدێن ئەرمەنەکان دوایان دەکەون و خێزانی (مملان) دەستگیر دەکرێت))[1]. ئەم شکستە وای لە میری ڕەوادی کرد بۆ جارێکی تر خۆی ڕێکبخاتەوە، بە وتەی (اسوغیك) ی مێژوونووس کە دەڵێ:((مملان) سوپایەکی زۆری کۆکردەوە، جگە لەخەڵکی ئازربیجان دانشتووانی ناوچەی خوراسان و جیهانی ئیسلامی بە ناوی غەزاوە بەشداریان تێدا کرد)) ناوبراو لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت{(مملان) نیازی وابوو کە دەست بەسەر ئەرمەنستان و گورجستان دابگرێت، بەڵام ئەرمەنەکان و (کرج) و (غاغیق)ی پاشای ئانی سوپایەکی هاوبەشیان پێکهێنا بۆ جاری دووەم (مملان) شکستی خوارد[2]. ناکۆکی شەڕو غەزاکانی (مملان) تەنها لەگەڵ ئەرمەن و گورجدا نەبوو، بەڵکو لەگەڵ ڕوم و ڕووسەکانیش شەڕی کردووە[3].

هەروەها میرنشینی حەسنەوەیهیش لەم دیاردەیە بەدەرو نەبوو، گیرۆدەی شەڕو ململانێی هێزە هاوسەردەمییەکانی بوون، بە تایبەتی لەگەڵ بوەیهییەکان پەیوەندییەکی ناجێگیریان هەبوو، کە هەندێك جار هێرشی

---

١- احمد کسروی، م. س، ص ١٧٥-١٧٦. حسام الدین النقشبندي، اذربیجان، ص١٤٣- ١٤٤.

٢- أحمد کسروی، م. س، ص ٢٨٦. حسام الدین النقشبندي، اذربیجان، ص١٤٥-١٤٦ . حسین حزنی، کوردستانی موکریان، ل ٢٤٨. منسور مەخدوم، س، پ، ل٨٤.

٣- حسین حزنی، کوردستانی موکریان، ل ٢٤٤.

دەكردە سەر حەسنەوەیهییەكان و دەستیان لەكاروباری ناوخۆی وەردەدا، لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز)دا (عضد الدولة) ی بوەیهی شاڵاوی هێنایە سەر هەرێمی چیاو لە سەرەتادا رووی كردە نەهاوەند و دواتر دەینەوەر و قەڵای سرماج، هەرچی سەروەت و سامان و ئازووقەی حەسنەوەیهیەكانی تێدا بوو دەستی بەسەرداگرت، كە ڕێژەیەكە یەكجار زۆر بوو، ژمارەیەك لە قەڵاكانی داگیركرد[1].

دوابەدوای ئەم داگیركارییە كوڕەكانی حەسنەوەیهی كوشت و تەنها (بدر)ی هێشتەوە وەكو دەسەڵاتدار بەسەر ئەم ناوچانەدا[2]. بالێرەدا ئەمە ڕوون بكەینەوە كە بەشێك لەو پەیوەندییە ناتەبایی و نا تەندروستەی لە نێوان ئەم میرنشینەو بوەیهیەكاندا هەبووە، هۆكارەكەی خودی حەسنەوەیهیەكان بووە، كە لە ناكۆكی نێوان بوەیهییەكان بەشداریان دەكرد پاڵپشتی لایەنێكیان دەكرد لە دژی لایەنەكەی تر[3].

هەروەك دەبینین لە ساڵی (٣٧٧ك/٩٨٧ز)دا (شرف الدولة) سوپایەكی زۆری ئامادەكرد و فەرمانی پێدان بۆ لێدان و كوشتاری (بدر كوڕی حسنویه) كە هۆكارەكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە (بدر) لایەنگری و پاڵپشتی (فخر الدولة)ی مامی كردبوو، بۆیە كاتێك دەسەڵاتی لە بەغداد جێگیر بوو هەوڵیدا ئەو تۆڵەیە لە حەسنەوەیهییەكان بكاتەوە، سوپای هەر دوولا لە قرمسین بەیەككەیشتن دواجار بەشكستی بوەیهییەكان كۆتایی هات[4].

لە ڕاستیدا یەكێك لە فاكتەرە سەرەكییەكانی تیاچوون و هەرەسهێنانی ئەم میرنشینە بە كاریگەری و كارتێكردنی شەڕو هێرشكاری بوەیهییەكان بوو، كە ڕەنگدانەوەی لەسەر پێكهاتەی میرنشینەكە هەبوو. لە لایەكی تر

١- الروذراوري، م. س، ج٦، ص١١. ابن الأثير، الكامل، جـ٧، ص٣٧٢ .

٢- الروذراوري، م. ن، ج٦، ص١١. ابن الأثير، م. ن، جـ٧، ص٣٧٢.

٣- حمدالله مستوفي، م. س، ص٤٢١. عبد الجبار ناجی، الامارة المزيدية فی الحلة، دار الطباعة الحديثة، بغداد ١٩٧٠، ص١٨١ .

٤ - الروذراوري، م. س، ج٦، ص٨٥. ابن الأثير، الكامل، جـ٧، ص٤١٨.

